زمانێک بۆ دەربڕینی بیرەکە بەکاردەهێنرێت پێویستە توانای کارکردنی لە جۆری بیرکردنەوەی پەیامەوەرگرەکە هەبێت لەڕێی هەڵبژاردنی چەندین وشەی واتاداری کاریگەر، کە جیاواز بێت لەزمانی ئاخاوتنی (Speak) ڕۆژانەی خەڵکی. کەواتە زمانی نووسین باڵاتر و کاریگەرتر و نەمرترە لە زمانی ئاخاوتن.

واتە زمان لەنێو هۆنراوەدا پێویستە وەک ئامرازێک، نەک ئامانج مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت، چونکە زمان ئەگەر بووە ئامانجی هۆنراوەکە ئەوسا هۆنراوەکە و وێنە بابەتییەکەی دەبێتە قاوغێکی زمانەوانیی بارگران بەسەر پەیاموەرگرەوە، بۆیە ڕێبازی بونیادگەری Structuralism نەیتوانیوە هۆنیار و چیرۆکنووس و شانۆنامەنووس دروست بکات، بەڵام توانیویەتی چەند لێکۆڵەرێک لەم بوارەدا دروست بکات بەدوای چۆنێتی ریزکردنی فۆنیمەکانی هەر مۆرفیمێک بگەڕێن، بەدوای ژمارەی فۆنیمەکان، یان مۆرفیمەکان لەنێو رستەدا بگەڕێن، لە سروشتی بینای زمانەوانیی هۆنراوەکە و رستە و دەستەواژەکانی بکۆڵنەوە تا لایەنی سیستەمی زمانەوانی هۆنراوەکە و وێنەکانی بۆ هۆنیار و خوێنەرانی شیتەڵ بکەنەوە. لێرەدا پێویستە ئەوە روون بکەینەوە زۆری بەکارهێنانی یەک فۆنیم، یان مۆرفیم لەنێو رستەکانی هۆنراوەکە دەلالەتی ئارەزوویەکی دروستکەرانەی هۆنیار لەم بوارەدا راناگەیەنێت، هەروەک چۆن کەمیی بەکارهێنانی فۆنیمێک، یان مۆرفیمێک دەلالەتی شەرەفداری و زۆر بایەخی ئەم فۆنیم و مۆرفیمە راناگەیەنێت، بەڵکو دەتوانین لەڕووی دەلالەتی دەروونییەوە واتای ئەو مۆرفیمانە مامەڵەی لەگەڵدا بکەین، چونکە هەندێک وشەی وەک (ئاسمان، ئەستێرە، خۆر، ئاو، ژیان، بەهار) دەلالەتی خۆشی بەخشن لەڕووی دەروونییەوە، بەڵام هەندێک وشەی دیکەی وەک (تاریک، ئازار، بەندیخانە، نەخۆشخانە، مردن) دەلالەتی ناخۆشی بەخشینن لەڕووی دەروونییەوە. ئەم جۆرە وشانە ڕۆڵی کاریگەریی خۆیان هەیە لە بینای وێنە دەروونییەکاندا. لێرەدا پێویستە هۆنیار لایەنی وشەبازی نەکاتە دواپەیام و ئامانجی هۆنراوەکەی، چونکە هۆنیاریش ئەرکی ئاسانکردنی تێگەیشتنی هۆنراوەکەی لەسەرە بەرانبەر کۆششی خوێنەر و پەیاموەرگر بۆ چێژوەرگرتن لە دەقی هۆنراوەکە، نەمریی هۆنراوە لە یادی خوێنەردا پابەندە بەجۆری زمانی هۆنراوەکە و وێنە بابەتییەکەی.

داهێنان لە بوارەکانی زمانی شیعری هەمیشە فاکتەرێکی گرنگی

نوێبوونەوەی شیعری کوردی بووە لە کۆنەوە تا ئەم رۆژگارە، لێرەدا دەکرێت پێناسەی داهێنانی شیعری بەوە بکەین" توانایەکی تایبەتە، بە زۆری لە زمانی شیعردا دەبنرێت و پێویست دەبێ ئەگەرچی دەکرێت لە هەندێک شێوازی تری ئەدەبدا هەبێت"[٣١]. هۆنیار بۆ داهێنان و نوێکردنەوەی زمانی شیعریی هۆنراوەکانی سوودێکی باش لە بواری کێڵگەی زمانی رەسەنی کوردی وەردەگرێت، چونکە نوێکردنەوەی زمانی شیعری پێوەندییەکی زۆری بە زمانە رەسەنەکەوە هەیە. کەواتە" تا رەسەنایەتی نەبێت، داهێنان نایەتە کایەوە، واتە تا شاعیر شارەزایی لە یاساکانی زمانەکەدا نەبێت، ناتوانێت لەم یاسایانە لابدات یان بیانبەزێنێت"[٣٢].

داهێنانی شیعری زۆرجار بە واتای بەکارهێنانی شتی تازەی نوێباو دێت، کەوا پێشتر بەکار نەهاتبێت، بەکارهێنانی وشەی تازەی هەڵبژێراو لە گەنجینەی زمانی نەتەوەکەی هۆنیار یەکێکە لە بەڵگەکانی هەبوونی داهێنانی شیعری. لەم بارەیەوە پ.د. محەمەد مەعرووف فەتاح دەڵێت: "بەکارهێنانی وشەی نوێباو لە شیعری کوردیدا دیاردەیەکی نوێ نییە و هەر لە کۆنەوە تا ئێستە بەردەوامە، هەندێک جاریش لادانەکە لەوەدایە کە یاسایەکی وشەرۆنان دەگشتێنرێت. واتا شێوەیەکی بڵاوتری دەدرێتێ و بەسەر وشەدا پیادە دەکرێت کە لەوەپێش لەسنووری ئەو یاسایەدا نەبووە"[٣٣].

هەوڵدانی هۆنیار بۆ زۆرکردنی ژمارەی هۆنراوە نەمرەکانی لە یادی خوێنەراندا ئەرکێکی پیرۆزە لەڕێی زمانێکی قورس و رەمزی نایەتە دی، بگرە لەڕێی زمانێکی رەوان و باوی نێو خەڵکییەوە دێتە دی، هەروەها ئەم جۆرە زمانە رەوان و باوەی نێو خەڵکی رۆڵی خۆی هەیە لە بەخشینی مۆرکێکی واقیعی بەجیهانی هۆنراوەکە.

هەموو هۆنراوەیەک لە رووی زمانەوانییەوە لە چەند رستەیەک پێکدێت، هەرچەند رستەی هۆنراوەیی کورت بێت ئەوەندە ئاسانتر لەبەر دەکرێت و لە یادی خوێنەردا بە نەمری دەمێنێتەوە، بە پێچەوانەیشەوە ئەنجام روودەدات ئەگەر هۆنیار کەمتەرخەمی کرد لە بواری بایەخدان بە جۆری رستەکانی نێو هۆنراوەکە و پەنای بۆ هەندێک رستەی درێژ برد.

لەنێو رستەکانی هەر هۆنراوەیەک جۆرە وەستان و پشوویەک هەیە خوێنەر دەرکی پێدەکات، بەڵام لەنێو دێڕەکانی رستەی هۆنراوەییشدا جاروبارێک ئەو جۆرە وەستان و پشووە بەدی دەکرێت، لە هەموو حاڵەتێکدا ژمارەی

جارەکانی وەستان و پشوودان پابەندە بەشێوازی زمانەوانیی هۆنیارەکە لە بینای رستەکانی نێو هۆنراوەکەی. لەم رۆژگارەدا وشەکانی یەک رستەی شیعری بەسەر چەند دێڕێکی پۆستەرە شیعرییەکە دابەش دەکرێت، هەروەها لەنێو هۆنراوەی هەندێک هۆنیاردا سنووری نێوان رستەکان نازانرێت لەبەر فەرامۆشکردنی لایەنی خاڵبەندی لەنێو دێڕەکانی هۆنراوەکە، بەڵام ئەم دوو دیاردەیە لەنێو هەندێکی دیکەی هۆنراوەی کوردی هەبوونی نییە.

### ئەنجام

١- ئەگەر زمانی کوردی ناسنامەیەکی نەتەوەییی مرۆڤی کورد بێت، ئەوا زمانی شیعریش ناسنامەیەکی داهێنانی شیعرییە بەهای هونەریی تایبەتیی خۆی هەیە.

٢- زمانی شیعری وەک زمانێکی باڵا جیاوازە لە زمانی رۆژانەی خەڵکی.

٣-زمانی شیعری وەک بوونەوەرێک لە ئۆرگانی شیعری خاوەن هەندێک خەسڵەتی تایبەتی خۆیەتی.

٤- دیارترین لایەنەکانی زمانی شیعری لەوەدایە هۆنیار (شاعیر) بە ئەنقەست هەندێک رستە و دەستەواژەی نێو دەقەکەی هەڵدەبژێرێ لەڕووی سەرسوڕمان و پرسیارکردن و ئەرێ و نەرێ و رستەی واتادار و جۆرەکانی رستەوە.

٥- لە توانای زمانی شیعریدا هەیە خوێنەر بباتە نێو ناخی ژیانی کۆمەڵەکەی، یان دووری بخاتەوە لە راستیی ژیانی خۆی، بەپێی ئەو جۆرە زمانە شیعرییە لەنێو جیهانی هۆنراوەکە بەکارهاتووە.

٦-زمانی شیعری لەنێو هەردوو جۆری شیعری کلاسیکی و نوێدا هەندێک جیاوازی بە خۆیەوە دەبینێت، زمانی شیعری لە هۆنراوەی کلاسیکیدا توانای شیعریی هۆنیار دەردەخات لە بەکارهێنانی جۆرە زمانێک بە هۆیەوە جیادەکرێتەوە لە هۆنیارانی دیکە، بەڵام ئەم دیاردەیە لە شیعری هاوچەرخی کوردیدا هەبوونی نییە، بگرە زیاتر لەبواری شێوازی داڕشتنی شیعریدا رۆڵی گرینگیی خۆی هەیە.

٧-لە شیعری نوێ و پەخشانە شیعردا سروشتی زمان دەقاودەق وەک ئەوەی لەنێو شیعری کلاسیکیدا نییە، چونکە بە حوکمی ئەوەی سەرهەڵدانی

شیعری نویٚ بە جۆرە نوێکردنەوەیەکی ڕەوتی شیعر دادەنرێت.

٨- هەندێکجار وشەی نێو زمانی هۆنراوەی هاوچەرخی کوردی خاوەن واتای ڕوونی تایبەتی خۆیەتی، بەڵام هۆنیار بەئەنقەست بەشێوەیەکی ئاڵۆز واتای وشەکانی نێو هۆنراوەکەی دەچنێت، لە ئەنجامدا خوێنەر سەری لیٚ دەشێوێت بە ئاسانی لە واتای گشتیی هۆنراوەکە تیٚ ناگات.

٩- زمانی دەقی شیعری کوردیی هاوچەرخ هەندێک لایەنی لادانی زمانەوانی تێدا بێت لە ڕووی بەکارهێنانی وشەی فەرهەنگیی تازە و واتادار و کاریگەر، هەروەها بەکارهێنانی دەستەواژەی خاوەن ئیدیۆمی تایبەت و پەنابردنە بەر بەکارهێنانی ڕستەی شیعری زۆر کورت یان زۆر درێژی سەرنجڕاکێشی پڕ لە ئەندێشەی هونەری.

١٠- هەموو هۆنراوەیەک لە ڕووی زمانەوانییەوە لە چەند ڕستەیەک پێکدێت، هەرچەند ڕستەی هۆنراوەیی کورت بێت، ئەوەندە ئاسانتر لەبەر دەکرێت و لە یادی خوێنەردا بە نەمری دەمێنێتەوە، ئەم جۆرە دیاردەیە زیاتر و زۆرتر لە ڕێزمانی شیعری کوردیی هاوچەرخدا بەرچاو دەکەوێت.

**پەراوێزەکان:**

١-د. ئازاد ئەحمەد مەحموود- بونیاتی زمان لە شیعری هاوچەرخی کوردیدا، چ/٢، لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی ژمارە ١٨٨، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢، ل١٧.

٢-هەمان سەرچاوە، ل١٠.

٣-هەمان سەرچاوە، ل١٤٤.

٤-هەمان سەرچاوە، ل١٤٩.

٥-هەمان سەرچاوە، ل١٣٦.

٦-محەمەد عەبدولکەریم ئیبراهیم -پێکهاتەی زمانی شیعری لە ڕوانگەی ڕەخنەی ئەدەبیی نوێوە، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢، ل١٩.

٧-دیوانی نالی -مەلا خدری ئەحمەدی شاوەیسی مکایەلی، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و فاتح عەبدولکەریم /محەمەدی مەلا کەریم، ئەندامی یاریدەری کۆڕی زانیاری کورد پیاچووەتەوە، چا/٢، تهران، ١٣٧٩ی فارسی، ل٢٤٦.

٨-کەریم شارەزا -نالی و زمانی یەکگرتووی کوردی، چاپخانەی الادیب، ١٩٨٤، ل٢٧.
٩-دیوانی گۆران، چاپی دووەم، تهران، ١٣٨٥ فارسی، ل٤٩.
١٠-دیوانی شێخ نووری شێخ سالح -چاپی دووەمی بژارکراو، بەرگی یەکەم، ئازاد عەبدولواحد کۆی کردووەتەوە و ساغی کردووەتەوە و لەسەری نووسیوە، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨، ل٥٨٧.
١١-مەسعوود محەمەد-چەپکێک لە گوڵزاری نالی، چا/٣، چاپخانەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٠، ل٥٢.
١٢-سەباح رەنجدەر-کۆشیعری سروودی زەوی، هەولێر، ٢٠١٢، ل٣٨
١٣-دیوانی نالی، ل٣٢٠-٣٢١.
١٤-د. ئازاد ئەحمەد مەحموود-بونیاتی زمان لە شیعری هاوچەرخی کوردیدا، ل١٤٢.
١٥-قوبادی جەلیزادە-دیوانی (شەهید بە تەنیا پیاسە دەکات)، چ/٢، چاپخانەی ئاراس، ٢٠٠٧، ل٢٣.
١٦-هەمان سەرچاوە، ل٢٨.
١٧-عەباس عەبدوڵڵا یووسف -تاککلی جمزێ و پەنجا تاکدێڕی تر، گۆڤاری گەلاوێژی نوێ، ژ/٥٩، کانوونی دووەم، ٢٠١٣، ل١٧٩-١٨٥.
١٨-هایکۆ چییە؟، وەرگێڕانی لە فارسییەوە: محەمەد تەرەغە، گۆڤاری هەنار، ژ/٨٣، دیسمبر٢٠١٢، ل١٢٩-١٤٤.
١٩-هاشم سەڕاج-شیعری نانۆ، گۆڤاری نەوشەفەق، ژ/٩٠، کانوونی دووەمی٢٠١٣، ل٩١-٩٦.
٢٠-ئەنوەر مەسیفی-کۆشیعری (شەیتان)، هەولێر،٢٠٠٣، ل٣٥.
٢١-بورهان ئەحمەد -کۆشیعری (هەڕەشەکانی ژنێک)، چاپخانەی دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨، ل٣٦.
٢٢-پرۆفیسۆر د. محەمەد مەعرووف فەتاح -لێکۆڵینەوە زمانەوانییەکان -کۆکردنەوە و ئامادەکردنی شێروان حوسێن خۆشناو و شێروان میرزا قادر، چاپخانەی رۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١٠، ل٤١٨.
٢٣-بەلای رۆمان یاکۆبسنەوە (١٨٩٦-١٩٨٢) زمانی باڵا ئەو زمانەیە کە بۆ قسەکردن لەبارەی زمانەوە بەکاردێت، زمانی ئاساییش کە بۆ قسەکردن لەبارەی شتەکانی دەوروبەر بەکاردێت. بڕوانە: محەمەد عەبدولکەریم ئیبراهیم

-پێکهاتەی زمانی شیعری لە روانگەی رەخنەی ئەدەبیی نوێوە، ل٢٠.

٢٤-محەمەد عەبدولکەریم ئیبراهیم-پێکهاتەی زمانی شیعری لە روانگەی رەخنەی ئەدەبیی نوێوە، ل١٥.

٢٥-پرۆفیسۆر د. محەمەد مەعرووف فەتاح -لێکۆڵینەوە زمانەوانییەکان، ل٤١٨.

٢٦-سەباح رەنجدەر-کۆشیعری (خەون وا خۆی گێڕایەوە)، چ/ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٤، ل٥٩.

٢٧-سەباح رەنجدەر-کۆشیعری ساڵی سفر، چاپخانەی کەمال، سلێمانی، ٢٠١٠، ل١٤٥.

٢٨-پرۆفیسۆر د. محەمەد مەعرووف فەتاح-لێکۆڵینەوە زمانەوانییەکان، ل٤٠١.

٢٩-هەمان سەرچاوە، ل٤٠١.

٣٠-دیوانی گۆران، ل٢٨.

٣١-پرۆفیسۆر د. محەمەد مەعرووف فەتاح-لێکۆڵینەوە زمانەوانییەکان، ل٤٠١.

٣٢-هەمان سەرچاوە، ل٤٠٢.

٣٣-هەمان سەرچاوە.

## سەرچاوەکان:


١-د. ئازاد ئەحمەد مەحموود-بونیاتی زمان لە شیعری هاوچەرخی کوردیدا، چ/٢، لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی ژمارە١٨٨، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر،٢٠١٢ .

٢-ئەنوەر مەسیفی-کۆشیعری (شەیتان)، هەولێر،٢٠٠٣ .

٣-بورهان ئەحمەد-کۆشیعری (هەڕەشەکانی ژنێک)، چاپخانەی دەزگای ئاراس، هەولێر،٢٠٠٨ .

٤-کەریم شارەزا-نالی و زمانی یەکگرتووی کوردی، چاپخانەی الادیب،١٩٨٤ .

٥-دیوانی گۆران، چاپی دووەم، تهران، ١٣٨٥ فارسی.

٦-دیوانی شێخ نووری شێخ ساڵح-چاپی دووەمی بژارکراو، بەرگی یەکەم،

ئازاد عەبدولواحد کۆی کردووەتەوە و ساغیکردووەتەوە و لەسەری نووسیوە، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر،٢٠٠٨ .

٧-دیوانی نالی-مەلا خدری ئەحمەدی شاوەیسی مکایەلی، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و فاتح عەبدولکەریم /محەمەدی مەلا کەریم ئەندامی یاریدەری کۆڕی زانیاری کورد پیا چووەتەوە، چا/٣، تهران، ١٣٧٩ی فارسی.

٨-سەباح رەنجدەر-کۆشیعری (خەون وا خۆی گێڕایەوە)، چ/ئاراس، هەولێر،٢٠٠٤ .

٩-سەباح رەنجدەر-کۆشیعری ساڵی سفر، چاپخانەی کەمال، سلێمانی،٢٠١٠ .

١٠-سەباح رەنجدەر-کۆشیعری سروودی زەوی، هەولێر،٢٠١٢ .

١١-قوبادی جەلیزادە-دیوانی (شەهید بە تەنیا پیاسە دەکات)، چ/٢، چاپخانەی ئاراس،٢٠٠٧ .

١٢-عەباس عەبدوڵلا یووسف-تاککلی جمزێ و پەنجا تاکدێڕی تر، گۆڤاری گەلاوێژی نوێ، ژ/٥٩، کانوونی دووەم،٢٠١٣ .

١٣-هاشم سەراج-شیعری نانۆ، گۆڤاری نەوشەفەق، ژ/٩٠، کانوونی دووەمی٢٠١٣ .

١٤-محەمەد عەبدولکەریم ئیبراهیم-پێکهاتەی زمانی شیعری لە روانگەی رەخنەی ئەدەبیی نوێوە، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر،٢٠١٢ .

١٥-د.محەمەد مەعرووف فەتاح-لێکۆڵینەوە زمانەوانییەکان-کۆکردنەوە و ئامادەکردنی شێروان حوسێن خۆشناو و شێروان میرزا قادر، چاپخانەی رۆژهەلات، هەولێر،٢٠١٠ .

١٦-مەسعوود محەمەد-چەپکێک لە گوڵزاری نالی، چا/٣، چاپخانەی ئاراس، هەولێر،٢٠١٠ .

١٧-هایکۆ چییە؟، وەرگێڕانی لە فارسییەوە: محەمەد تەرەغە، گۆڤاری هەنار، ژ/٨٣، دیسەمبەر ٢٠١٢، ل١٢٩-١٤٤.

# پاول سیڵان
# "گوڵەباخی هیچ کەس"



## لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی و ئەدەبی و دۆخیاری هۆنراوەی "زەوی لە ناخیاندا هەبوو"

د. لەتیف هەڤرێست
ڤیەننا- ئوتریش

### پێش وتار

زمان هەر لە سەرەتای جێگیربوونییەوە وەک سیستمی کۆدوویی (communication) بێجگە لە بەکارهێنانی وەکو کەرەسەی گفتوگۆ و ئاڵوگۆڕی زانیاری، هاوکات کەرەسەی گەڵاڵەکردنی بیر و دەربڕینی هەستیش بووە. هەر لەم روانگەی دەربڕینی هەستەوە، ژانری وشەدارشتن لە فۆرمێکی تایبەتیدا (هۆنراوە/شیعر) هاتەکایە، کە تێیدا رووداوەکانی رۆژانەی ژایان لەجیاتی ئەوەی لە دەمەتەقێیەکی نێوان کەسیدا باس بکرێت و بگێڕدرێتەوە،

به ریتمێکی دەنگی دەردەبڕدران. ئەم جۆرە خستنەڕووی باس بەتایبەتی بەبۆنەی پێشهاتی ناخۆش و ناهەموارەوە بەکاردەبرا و دوو مەبەستی بوو: (١) ئارامکردنەوەی دەروونی خۆ و رەواندنەوەی ئەو نارەحەتییەی کە بەهۆی ئەو رووداوەوە لە ناخی وێژەردا بەرپا بووە. (٢) هەژاندنی هەستی گوێگرانی باسەکە. واتە هۆنراوە لە سەرەتادا زیاتر بۆ دەربڕینی ئازارچەشی (معاناە) بەکار دەهات، بۆ دەربڕینی هەستی نارەحەتی هاوبەش و هەژاندنی هەستی بەکۆمەڵی ئەو کەسانەی رووداوەکە زیانی پێ گەیاندوون. پاشان ئەم جۆرە گێڕانەوەی باسە بۆ خۆشی و بۆ دەربڕینی هەستی ناسکیش بەکار برا. ئازارچەشی هەتا ئەمڕۆش هەر بەشێکی گەورەی هەستدەربڕینی هۆنراوە پێکدەهێنێت و بگرە لە هەزارانساڵی داهاتووشدا هەر وا دەمێنێتەوە. ئەمڕۆش هەموو دەستەمرۆڤ و گەلانی جیهان لە کاتی تووشیاری (**کارثة**) ناهەموار و دڵتەزێندا پەنا دەبەنە بەر هۆنراوە، بۆ ئەوەی سەنگینی ئەو فشارە دەروونییەی ئەو پێشهاتە دڵتەزێنە بەرپای دەکات، کەم بکەنەوە. بۆ تێڕوانینی پەیوەندی نێوان زمان و هەست و هۆنراوە وەکو ئامرازێکی کۆمەڵتەنی دەربڕی هەست تووشیارییەکی دڵتەزێنی سەدەی رابردوو دەهێنمە بەرچاو، کە هەتا ئەمڕۆش دەروون دەهرووژێنێ و بابەتی باسی سیاسی و کۆمەڵایەتی هونەری و ئەدەبی هەموو دنیایە. مەبەست لەو تووشیارییە رووداوی "حاشۆوا"[١]یە، کە تێیدا بە هەزاران ژن و پیاو و منداڵ و گەنج و پیری جوولەکە بەدەستی نازییەکانی ئەڵمانیا بە نیازی قەلاچۆکردنیان بەکۆمەڵ کوژران. لەم باسەدا دەمەوێت رەنگدانەوەی ئەم کارەساتە لە هۆنراوەی کەسێکی سەر بەو دەستە مرۆڤەدا راڤە بکەم، کە گورزی ئەو تووشیارییە درا بەسەریانا و هەتا ئەمڕۆش زامێکی دەروونی سارێژ نەبووی میللی تێیاندا بەجێهێشتووە. مەبەست لەو کەسەش هۆنەری (شاعری) ئەڵمانی-زمان پاول سێلان-ە.

## پاول سێلان کێ بوو؟

پاول سێلان لەڕاستیدا ناوی -پاول ئەنچل- ە، لە ساڵی ١٩٢٠ لە بنەماڵەیەکی ئەڵمانی- زمانی جوولەکە لە چێرنۆڤیتز/بوکۆڤینا لە ئوکراییینا هاتووەتە دنیا. لە دوای جەنگی دووەمی جیهانی زماننناسی و جێرمانیستک (دراساتی ئەڵمانی) لە پاریس و بوخارست خوێند. لە ساڵی ١٩٤٨ بەدواوە وەکو وەرگێڕ و مامۆستای زمان لە پاریس کاری کردووە.

سێلان ژمارەیەکی زۆر دیوانی هۆنراوەی بڵاوکردووەتەوە، لەنێوانیاندا:

"لمی ناو کاتژمێرە لمییەکان (١٩٤٨)، "خەشخاش و بیرەوەری (١٩٥٢)، "لەبەر دەرگایەکەوە بۆ بەردەرگایەکی تر" (١٩٥٥)، "تۆڕەکانی زمان" (١٩٥٥)، "گوڵەباخی هیچ کەس" (١٩٦٣)، "کریستالی هەناسە" (١٩٧٠)، گەڕانەوەی هەناسە" (١٩٦٧)، "رەشە باج" (١٩٦٩)، "زۆری تێشک" (١٩٧٠)، "بەشێک لە بەفر" (١٩٧١). بێجگە لەمانەش زۆر کاری وەرگێڕانی لە زمانی رووسی و ئینگلیزی و ئیتاڵی و فەڕەنسییەوە کردووە. ساڵی ١٩٦٠ خەڵاتی (Georg-Büchner)ی پێ درا. پاول سێلان لە ساڵی ١٩٧٥ لە پاریس کۆچی دوایی کرد.

### پاول سێلان و وشەسازیی لە هۆنراوەدا؟

پاول سێلان یەکێکە لە هۆنەرە (شاعرە) هەرە ناودارەکانی دوای جەنگی دووەمی جیهانیی. ئەو هۆنەرێکی هێندە کارا و هونەرمەند بوو، کە تەواوی وجودی خۆی هاویشتبووە ناو مژەڵۆکی (sog) وێنە-وشەییەکانەوە. وشە وەکو هەویر وابوو لە پەنجەکانی مێشکیدا و بۆ هەر بارودۆخێک پەیکەرێکی دەقاودەق شیاوی بۆ دەخولقاند. وشە وەکو رەنگ وابوو، کە سێلان بە فلچەی هزری تابلۆگەلێکی پێ دەکێشا، کە دیدەگاگەلێکی ساکار، بەڵام ئێجگار قووڵ تا ناخی دەروونیان رووبەڕووی خوێنەر دەکردەوە. ناشتایی و ئیلهامی سروشت-ئامێزیی سێلان بۆ کاریگەریی جادووسازی وشە لە هۆنراوەکانیدا وەکو پلانێت[٣] بەدەوری خۆری بیرەکان دەسووڕێنەوە و تەمومژێکی گەردوونی پێکدێنن، کە ساکارییەکی تار، سادەیی تەلیسمی شەوگار، لە نسرمی بەرپەرچ نەدراوی رووداوەکاندا دەکاتەوە بە تۆپەڵە تیشکی دەنگ و خۆیان دەهاوێژنە ناو هەستە دەرەکییەکانی خوێنەر.

### گەردوونی هۆنراوەکانی سێلان

زمان لە هۆنراوەکانی "سێلان"دا وەکو ئامرازێکی گرنگی دەربڕین لە هەمان کاتدا رەوتدەرێکە (orientation) بۆ هەست، بۆ بیر، بۆ دەرک، بۆ کردەک و بۆ هەڵوێست. خوێنەری تابلۆ وشەییەکانی سێلان لە گەردوونێکدا خۆی دەبینێتەوە، کە رووداوەکان وەکو مۆرکێک خۆیان ئەسمن لەڕووی کات و خوێنەر دەکێشنە ناو ئەو بارودۆخە زەمەنییەوە، کە تێیدا پێشهاتەکان زیندوو لەسەر خولگەیەکی گەردوون-ئاسا بە دەوری کیانی هەستی و دەروونی خوێنەر لە ئێستادا دەسووڕێنەوە. ناکۆکی لەو گەردوونەدا ناوک و ناوەڕۆکی رووداوەکان پێکدەهێنێت: ناکۆکی لەگەڵ "خۆ" و لەگەڵ "خوا"، لەگەڵ ژینگە وەکو کەهکەشانی هەڵسوکەوت و هەڵوێستەکانمان و سروشتیش وەکو بارگەی "بوون" و "بیرگەکانمان". دوای کارەساتە تراژیدییەکەی ئۆردووگای زۆرەملەی ئاوشڤیتس

(Auscwitz) که بەکۆمەڵکوژی جوولەکان، تێیدا شێوازێکی سازمانگەری (institutionalized) گرتبووە خۆی، ئەدەبی ئەڵمانی، بەتایبەتی هۆنراوە و زمانی هۆنراوە لە دۆخێکدا خۆی بینییەوە، پەشۆکاو، کەم وزە، بگرە گەندەڵ بەهۆی کەچبەکارهێنانی لە لایەن رژێمی "ناسیۆنال-سۆسیالیزم"ەوە بۆ پروپاگەندە و چەواشەکردنی خەڵک. هۆنەران و نووسەران سڵیان لەوە دەکردەوە، خۆیان بدەن لە قەرەی رووداوەکانی سەردەمی ناسیۆنال-سۆسیالیزم (بەتایبەتی "حاشۆواە") لە ترسی ئەوەی کە وشەکان لە توانای ئەوەدا نەبن موعانات و ئێش و ئازارەکانی "حاشۆواە" بەشێوەیەکی شیاو و شایستە نیشان بدەن، سێلان دایک و باوکی لە ئۆردووگای زۆرەملەی نازییەکان لە "ترانسنیستریا" (Transnistria) لەدەست دا. سێلان لە ئاکامی ئەم رووداوەدا تووشی تراومایەک بوو، کە سەرانسەری ژیانی لە کۆڵی نەبووە و جێپێی نەک تەنها لە دەروونیدا، بەڵکو لە بەرهەمە هونەرییەکانیشیا بەجێهێشتووە. هەر لەم تراومایەشەوە هەمیشە لە ململانێدا بوو لەگەڵ "خوا" و وشەی خوا، لەگەڵ مرۆڤ و مرۆڤایەتی (بشریە)، لەگەڵ هەموو شتێک و لەگەڵ هیچ شت. ئەم بەربەرەکانییەی خوا و ناوەڕۆکی خوا وەکو هێزێکی ژوور سروشت ناکۆکییەکی دەروونی لەگەڵ خودی خۆی-سێلان پێکهێنابوو، کە ریشەیان لەناو هۆنراوەکانیدا بە هەموو لایەکدا هاویشتووە، بەڵام ئەم گومان و بەربەرەکانی و ناکۆکییە هەمیشە لە بەرزترن پلەی شیعری و هەستبزوێنیدا وشەکانی هۆنراوەکانی ئەویان دەخولقاند و هەتا ئێستاش وەکو ماگنێت خوێنەر لە خۆیاندا بەند دەکەن. سێلان تاکە نووسەر بوو کە دوای جەنگ وێرای خۆی لە قەرەی فاجیعەی "حاشۆواە" بدات و بە وشە، بە نووسین، بە شیعر و بە وزەی دەنگەکانی دەروونی ئەو کارەساتانە باس بکات. ئەگەر سەرنجی هەندێ لە هۆنراوەکانی دیوانی "گوڵەباخی هیچ کەس" بدەین و هەندێ لە تابلۆ وشەییە بەڕەنگەکانی لە هۆشدا بەرجەستە بکەین، ئەم راستییەمان بۆ روون دەبێتەوە و دەبینین کە چۆن وشەکان ناخمان دەکێشن بەرەو ناخی خۆیان و لە یەک یەکانەگی هەست و کاتدا یەکانگیرمان دەکەنەوە. لەم باسەدا چەند دانەیەک لە هۆنراوەکانی سێلان وەکو دیاری پێشکەش بە خوێنەرانی کورد-زمان دەکەم، بەڵام لە دانەیەک لەو هۆنراوانە (هۆنراوەی "لە ناخیاندا زەوی هەبوو") بە قووڵی دەکۆڵمەوە و رەنگدانەوەی تراژیدیای "حاشۆوا" و لەدەسدانی دایک و باوکی و بێدەنگیی جیهان بەرامبەر بەو کۆمەڵکوژییە مێژووییە و سستی و خۆبەدەستەوەدانی مرۆڤە لێقەوماوەکانی ئەو کارەساتە ئەخەمە بە چاوی خوێنەر کورد.

## له ناخیاندا زەوی هەبوو

له ناخیاندا زەوی هەبوو
ئەوان هەر خاکیان هەڵئەکۆڵی و هەڵئەکەند
بەم جۆره رۆژەکەیان بەسەرئەچوو، وه هەروەها شەوەکانیشیان
ئەوان ستایشی خوایان نەکرد،
ئەو خوایەی، که وەکو ئەیانبیست، هەموو ئەم کارەساتانه به ویستی ئەو بوون
ئەو خوایەی، که وەکو ئەیانبیست، ئاگاداری هەموو ئەم شتانه بوو.

ئەوان هەر خاکیان هەڵئەکۆڵی و گوێیان له هیچ شتێکی تر نەبوو،
ژیرتر نەبوون و چی تر گۆرانییان دانەهێنا،
هیچ زمانێکی تریان وەبیر نەکەوت،
تەنیا خاکیان هەڵئەکۆڵی.

خامۆشییەک خۆی سەپاند، هاوکات زریانیش هەڵی کرد،
دەریاکان هەموو هەڵچوون.
من خاک ئەکۆڵم، تۆ خاک ئەکۆڵیت، هەروەها کرمیش خاک ئەکۆڵێت،
گۆرانیبێژەکەیش لەوێ ئەڵێ: ئەوان خاک هەڵئەکۆڵن.

ئەی هەرکەس، ئەی هیچ کەس، هەی نەناسان، هۆ تۆ:
رێ بەرەو کوێ چوو، که بەرەو هیچ شوێنێک نەچوو؟
ئەوا تۆ خاک هەڵئەکۆڵیت و منیش خاک هەڵئەکۆڵم، خاک هەڵئەکۆڵم بەرەو لای تۆ
له ئاکامدا ئەڵقه له پەنجەماندا لێمان بێدار ئەبێتەوە.

ئەم هۆنراوەیە پێشانگەیەکی روونی ئەو گومانە بنەڕەتییەیە له بوونی خوا و له رەوشت-دروستی کۆمەڵ، گومانێک که له ئاکامی ئەزموونی جوولەکان له تووشیاری "حاشۆواه" بەرپا بوو، هەروەها گومان لەوەی که وشه (واته زمان)، بەتایبەتی هۆنراوه له توانایدا هەبێت، ئەو ئەزموونه تاڵه بەشێوەیەکی شایسته دابڕێژێت و ئەو دووچارییه (معاناه) بەرجەسته بکات.

وێژەر (قسەکەر) لەو هۆنراوەیەدا دوو بوار (دوو زنجیره کردەک) نیشان

دەدات، کە لەڕووی ڕەوتی (مجری) ڕووداوەکان و بەشداری ویژەر لەو ڕووداوانەدا جیاوازن لە یەک، بەڵام لە کردەی "خاک هەڵکۆڵین"دا هاوشێوەن. پرۆتاگۆنیستەکان لە هەردوو بوارەکەدا خاک هەڵدەکۆڵن (گۆڕ هەڵدەکەنن). بواری یەکەم لە دێڕی یەکەمەوە دەست پێ دەکات و لە دێڕی دوانزە کۆتایی دێت، بواری دووەم لە دێڕی سیانزە هەتا دێڕی هەژدە خۆی دەنوێنێت. لە بواری یەکەمدا ویژەر ڕووداوەکان لە ڕابردوودا دەگێڕێتەوە و باسی دەستەیەک کەسی نامۆ (ئەوان) دەکات، کە ئەم (واتە ویژەر) بەشێک لەوان نییە. ئەو دەستە کەسە وەکو پرۆتاگۆنیستێکی بەکۆمەڵ بە پێچەوانەی هەڵوێستێکی چاوەڕوانکراو ڕەفتار دەکەن ("ستایشی خوایان نەدەکرد"، " ژیرتر نەبوون"، "گۆرانییان دانەهێنا")، واتە لە ڕووی ڕێزمانی زمانییەوە کردەکانیان "نەفی" دەکرێت. لە بواری دووەمدا ویژەر خۆی وەکو "کەسindividual/" (ڕاوناوی کەسی: من) دەنوێنێت و قسە لەگەڵ کەسێکی تری هاودوو (تۆ) دەکات و هاوکات ناوی زیندەیەکی تری مرۆڤبەدەر (کرم) وەکو پرۆتاگۆنیستێکی تاک دەهێنێت. ئەم کەسانەی بواری دووەم هەمان کردەی بواری یەکەم (خاک هەڵکۆڵین) لە کاتی ئێستادا ئەنجام دەدەن و ویژەریش بەشێکە لەوان. بەم جۆرە لە هەردوو بوارەکەدا دوو دەستە کەسگەل (individual) وەکو ئۆپۆزیسۆن ڕووبەڕووی یەک دەوەستن: "ئەوان" (کۆمەڵێک فەردی نەناس و دیارینەکراو) دژ بە "من، تۆ، ئەو" ( چەند تاکەکەسگەلێکی ناسراو و دیاریکراو).

هۆنراوەی "لە ناخیاندا زەوی هەبوو" بریتییە لە بیرەوەریی مردووەکان، ئەوانەی لە فاجیعەی "حاشۆواه" گیانیان لەدەست دا و نرانە ژێر خاک، یان بەهۆی سووتاندنی جەستەکانیان بوون بە خاک. هەروەها بریتییە لە فکرەی ڕەدکردنەوەی ستایش و دروود بۆ خوا، خوایەک کە نەک تەنیا ئاگاداری هەموو ڕووداوەکان بوو، بەڵکو ڕووداوەکان بە خواست و ویستی ئەو پێش هاتن و پێش دێن. لەناوندی سەرنجە تەشبیهییەکانی ئەم هۆنراوەیە بۆ ڕووداوەکان کردەی "خاک-هەڵکۆڵین" بە ناو سەرانسەری هۆنراوەکەدا خۆی دەکێشێت و چاوگی ئەم "خاک هەڵکۆڵین"ەش لە ڕوانگەی هێمایەکی ئایینییەوەیە (تەورات: "قابیل" "هابیل"ی برای ئەکوژێ و لە ترسا خاکی بۆ هەڵئەکەنێ و ئەیشارێتەوە). "خاک هەڵکۆڵین" نەک تەنیا وەکو پرۆسەیەکی دەرەکی، بەڵکو وەکو پرۆسەیەکی ناوەکیش باس دەکرێت. ئەزموونی فیزیکی "خاک هەڵکۆڵین" لە دێڕی (... هەر خاکیان هەڵئەکۆڵی، و هەڵئەکەند ، بەم جۆرە ڕۆژەکەیان بەسەرئەچوو) لەگەڵ پەیوەندی نێوان جیهانی هەست و ئەم هێما ئەدەبییە ڕووبەڕوو دەبێتەوە، کە

لە دێڕی (ئەوا تۆ خاک هەڵئەکۆڵیت و منیش خاک هەڵئەکۆڵم، خاک هەڵئەکۆڵم بەرەو لای تۆ) خۆی بەدەر ئەخات. یەکخستنی ئەم پرۆسە ناوەکییە دەروونییەی "هەڵکۆڵین" لەگەڵ دەرکی واقیعی-مێژوویی موعاناتەکەی "حاشۆواە" دەتوانرێت بچوێنرێت بە دەستنیشانکردنی پێش داستانی نەخۆشی و دۆزینەوەی چارەسەر بۆی. پرۆسەی "بیرەوەری" لە هێمای "هەڵکۆڵین"دا یەکانگیر دەبێت. خودی کردەی وەبیرهێنانەوە وەکو هەڵکۆڵین (گەڕان و گەڕانەوە بۆ رابردوو) وەسف دەکرێت. یادگە (ژاکرە) رۆڵی کەرەسەیەکی پەیوەستیار (وسیگ/medium) بۆ بەسەرهاتەکان دەبینێت، وەکو چۆن "خاک" لەو هۆنراوەیەدا رابردوو و مردووەکان دادەپۆشێت. هەرچەندە لێرەدا سنووری نێوان فیزیک و دەروون بەیەکدا دەچن و هەردوو دیاردەکە تێکەڵ بە یەک دەبن، وا پێ دەچێت ئەمە کافی نەبێت بۆ ئەوەی بتوانرێت، یادهاتەکان جەمکار بکرێن. لێرەدا پرسیار دەربارەی هێزێکی باڵا و رێبەر دێتە ئارا، هێزێکی خوایی، کە سەرەڕای زانایی و توانایی دەتوانێت یان نایەوێت ئەو بارە سەنگینە (ئەو میحنەتە) لە سەر مرۆڤ لابات. ئەم هێزە ئاگاداری وەزعی خاک-هەڵکەناکان هەیە و دەشزانێت کە ئەم خاک-هەڵکەندنە کەسەکان بەرەو مەرگ دەبات. لە هەمان کاتدا لە توانایدا هەیە خۆی تێ هەڵقورتێنێت و مەردمەکان رزگار بکات، بەڵام نایکات:

(ئەوان ستایشی خوایان نەدەکرد،

ئەو خوایەی، کە وەکو ئەیانبیست، هەموو ئەم کارەساتانە بە ویستی ئەو بوون

ئەو خوایەی، کە وەکو ئەیانبیست، ئاگاداری هەموو ئەم شتانە بوو)

سێلان بەم دوو زنجیرە باسە دوو بەسەرهات رووبەڕووی یەک دەکاتەوە، بەسەرهاتێکی رابردووی پڕ لە رووداوی نێگەتیف (منفی) و خراپسازی لەگەڵ بەسەرهاتێک لە ئێستادا بە رووداوی پۆزەتیف (مثبت) و چاکسازییەوە. زنجیرە باسی یەکەم داستانی جۆرێک مرۆڤ- دەستەیەک مرۆڤ دەگێڕێتەوە، کە لە فشارێکی دەروونییەوە خۆی لە قاوغی ئافەریدەگی (خلقت) و خۆبەدەستەوەدانی مەرگ قایم کردووە و مل بۆ ئەو چارەنووسە کەچ دەکەن کە وەکو بەخشیدەی خوا بەسەریاندا سەپاوە. بە ئەم ورەبەردەرانە کاتەکانی ژیانی خۆیان بەفیڕۆ دەدەن، بەبێ ئەوەی سوودی لێ وەربگرن، پەیوەندی لەگەڵ کەسانی تر، یان میدیای هونەری و سازمانی بۆ ناساندنی خۆیان پێک بهێنن، یان هەست بە سۆزی سوپاسگوزاری و ستایش بۆ ژیان وەکو بەخشیدەیەکی خواوەندی بکەن. ئەگەر بێت و ئەم تابلۆ وشەییانە بخەینە ناو چوارچێوەی ئەزموونی حاشۆوای

جوولەکان، دەبینین کە ئەم زنجیرە کردەکە لە بواری یەکەمی هۆنراوەکەدا ئیشارەت بۆ قەلاچۆکردنی ئەو جوولەکانە دەکات، کە لە لایەن کۆماندۆ پیاوکوژە تایبەتییەکانی نازییەکانەوە بەکۆمەڵ دەستڕێژ کران. زۆرێک لەو دەستڕێژکراوانە پێش مەرگیان مەجبوور کران، بە دەستی خۆیان گۆڕەکانی خۆیان هەڵکەنن. ئەمانە لەو بڕوایەوە کە ئەم چارەنووسە بە ویستی خوایە، خۆیان دا بەدەست ئەو چارەنووسەوە و پێی قایل بوون.

بە پێچەوانەی زنجیرە رووداوی بواری یەکەم، لە زنجیرە باسی بواری دووەمدا پێناسکردنی پرۆتاگۆنیستگەلێکی تر رەوتێکی تر دەدات بە رووداوەکان، ئەمەش سەرئەنجامێکی تری بە پێچەوانەی سەرئەنجامی بواری یەکەم دێنێتە کایە. جیاوازی نێوان ئەم دوو بوارە خۆی بەتایبەتی لە جیاکاری نێوان دەرک (وعی) و هەڵوێستی پرۆتاگۆنیستەکاندا بەدەر دەخات. لە بەراوردی دەستە-مرۆڤی لەیەکچووی سست و بێخواستی بواری یەکەم (ئەوان)، لێرەدا کەسێک (فرد) دێتە کار، کە نەک بەئاگاییەوە رەفتار دەکات و بەئاگاییشەوە دەرک بە کەسانی تر دەکات، بەڵکو هونەرێکی زمانی پێکدەهێنێت، کە لەتوانایدا هەیە ئەو دەرکە هەستییەی کردەکە هاوبەشەکەیان بخاتە بەر چاو و رووالەتێکی بداتێ (گۆرانیبێژەکەیش لەوێ دەڵێت: ئەوان خاک هەڵدەکۆڵن- لێرەدا مەبەست لە "ئەوان" یەکخستنی "من" و "تۆ"یە). ئەم دەرکە و تەعبیرە شیعرییەکەی دژ بە داڕمانی دەرک و نەبوونی "گۆرانی" و "زمان" لە زنجیرە رووداوی بواری یەکەم دەوەستێت. بە خیلافی خاک-هەڵکۆڵینی بێ هەوار و بێ مەبەست لە بواری یەکەم، لێرەدا مەبەستی ئەو کردەکە (واتە خاک-هەڵکۆڵین) دەبێتە کێشەیەک، بەتایبەتی ئەگەر بەراوردی بکەین لەگەڵ بێخودی و پوچەڵەکیی گشتی هەمان کردەک لە رابردوودا. ئەم دەرک-کردنە بە پوچەڵی و بێ ناوەڕۆکی کردە و پرۆتاگۆنیستەکان لەم دێڕەدا بەدەردەکەوێت: "ئەی هەرکەس، ئەی هیچ کەس، هەی نەناسان، هۆ تۆ". تەنانەت هێماکردن بۆ کەسێکی تر لێرەدا دەبێتە کێشەیەکی هەستپێکراو، بگرە بوونی ئەو کەسە دەخرێتە ژێر تیشکی گومان: ئایا ئەم کەسە "کەس"ە، یان لێرەدا هیچ و هیچ کەسێک نییە؟ ئەوەی لێرەدا بە روونی دەبێتە کێشە، بریتییە لە پێکهێنانی کۆمەڵێک مرۆڤی هاودەست و هاوڕێ وەکو بنکەیەک بۆ تێکۆشان لە پێناوی مەبەستێکدا. پەیوەستکردنی "من خاک ئەکۆڵم، تۆ خاک ئەکۆڵیت" بەهۆی ئامرازی پەیوەندی "هەروەها" بریتییە لە بانگەوازێک، کە هێما دەکات بۆ پەیوەستییەکی هاودەنگی و هاوکاری لەگەڵ هاودەردەکانی تردا. لە کۆتاییشدا ئەم هاوکارییە لە کردەیەکدا (action) خۆی جێگیر دەکات،

که ئاراستەی کەسە هاودەردەکانی تر دەکرێت: "خاک هەڵئەکۆڵم بەرەو لای تۆ". لە ئاکامدا سەرکەوتن خۆی لە یەکێتییەکی پتەودا دەبینێت، کە لە راناوی کەسیی "ئێمە"دا دەستنیشان دەکرێت و لە وشەی "ئەڵقە"دا هێمای بۆ دەکرێت. ئەڵقەکردنەپەنجە (وەکو سیمبۆلی دەستنیشانکردن، یان زەماوەندکردن) ئەم سەرئەنجامە لەگەڵ کردەی "خاک هەڵکۆڵین"، کە بەدەست ئەنجام دەدرێت، دەبەستێت پێکەوە، گوزارەی "بێدار ئەبێتەوە" ئیستیعارەیە بۆ پێکهێنانی ئەو پەیوەستە وەکو گواستنەوە لە دۆخی خەوتووییەوە بۆ دۆخی بێداری، لە نەستەوە (اللاوعی) بۆ هەسەت (الوعی) و نیاز، وەکو پێنانە ناو دۆخێکی تازەوە، وەکو رووداو.

**چەند نموونەی تری هۆنراوەکانی سێلان (بەبێ شیتەڵکردنەوەیان):**

**وشەی بەناخداچوون**
**ئەو وشە بەناخداچووەی کە خوێندمانەوە،**
**ساڵەکان، وشەکانی ئەوسا**
**هێشتا هەر هەمان شتین.**

**تۆ بزانە! کەلێن بێ پایانە،**
**بزانە! تۆ پێویست ناکات بفڕیت،**
**بزانە! ئەوەی لە چاوتا نووسراون،**
**ئێمە ئەکێشێت بەرەو قووڵایی.**

**لە گەڵ شەراب و گومبووندا**
**لە گەڵ شەراب و گومبووندا**
**لە گەڵ بەرەوکۆتاییچوونی هەردووکیانا**
**بە ئەسپسواریی بە ناو بەفردا رێم تەی ئەکرد**
**بە ئەسپسواریی خوام برد بەرەو دووریی- بەرەو نزیکیی**
**ئەو گۆرانی ئەوت،**
**ئەوە دوایین سوارڕەویی ئێمە بوو بە سەر بەربەستە-مرۆڤەکانا**
**مرۆڤەکان خۆیان دائەنەواند کاتێ کە**
**ئێمەیان بەسەر خۆیاندا ئەبیست،**

ئەوان حیلکەکانی ئێمەیان وەرئەگێڕا
بۆ یەکێک لە زمانە هێماییەکانی خۆیان و
لە قالبی درۆدا دایانئەڕشت

پەڵە ئەستێرەی زۆر
ئەو هەموو پەڵە ئەستێرانەی،
کە بەسەر ئێمەوە ئاوێزانن.
کاتێ نیگای تۆم کرد-کەی؟-
من لە دەرەوە بووم، لە جیهانەکانی تر
ئای ئەو رێیەی، بەشێوەی کەهکەشان
ئای ئەو ساتەی
کە شەوەکانی بەرەو لای ئێمە کێشا،
بۆ ناو سەنگەباری ناوەکانمان،
من ئەزانم، کە ئێمە نەژیاوین
تەنیا هەناسەیەکی کوێر
خۆی کشاند بە نێوان ئەوێ و نە-ئێرە و هەندێ جاردا
چاوێک، بە وێنەی کشتەستێرێک[3] فیشکەی کرد
بەرەو هەموو شتە کوژێنراوەکان
لەو هەڵدێرانەدا کە بە کڵپەوە داکەوت،
کات وەکو گۆپکێکی بە شکۆ داچەقا،
لە توێی کاتدا
ئەوەی کە هەیە، کە بوو، کە لە ئایندەشدا ئەبێت
بەرەو ژوور، بەرەو خوار، بەرەو دووری رووا.
من ئەزانم،
من ئەزانم و تۆ ئەزانیت، ئێمە ئەمانزانی
ئێمە نەمانئەزانی، ئێمە
لەوێ نەبووین، بەڵکو لێرە بووین،
هەندێ جاریش، کاتێ
کە تەنیا "هیچ" لەنێوان ئێمەدا بوو،
بە تەواوی یەکترمان دۆزییەوە.

هەوڕاچوونی تۆ ئەمشەو
بە وشەکان تۆم هێنایەوە، تۆ لێرەیت،
هەموو شت ڕاستی-ە، تەنانەت چاوەڕوانی "ڕاستی"ش.

لاولاوێک بە ڕووی پەنجەرەکەمانا هەڵئەگەڕێت: بیر بکەرەوە
کێ لە پاڵ ئێمەدا ئەژی و تەماشای ئەکات.

دەربارەی خوا خوێندمان،
کە خوا بەشێکە و بەشێکی تریشی پەرش و بڵاو
لە مەرگا
نەشونما ئەکات بەرەو
هەموو شتە درەوکراوەکان.

نیگاکان
ئەمانگەیەنن بەرەو ئەوێ،
لەگەڵ ئەم نیوەیەدا
سەروکارمان هەیە.

بە تێکڕای بیرەکانمەوە
بە تێکڕای بیرەکانمەوە ڕۆیشتم
بەرەو دەرەوەی جیهان: ئەوە تۆ بوویت،
تۆ ئەی بێدەنگیی من، تۆ ئەی کراوەیی من،
تۆ بوویت کە پێشوازیی منت کرد.

کێ ئەڵێ،
کە هەموو شتێک لە ئێمەدا مرد،
چونکە چاومان شکا؟
هەموو شتێک بێدار بووەوە،
هەموو شتێک بەرەو بەرزی هەڵچوو.
هەتاوێک، گەورە... بە مەلەکردن هات بەرەو ڕوومان

**دەرەوونەکان روون و رۆشن، یەک بەیەک رووبەرووی وەستان**
**بوێرانە بێدەنگ بوون**
**لە ئاستی خولگەی ئەو.**

**لەسەرخۆ**
**باوەشت خۆی کردەوە،**
**بێدەنگ، هەناسەیەک هەڵچوو بەرەو "ئێتەر"[4]**
**ئەوەش کە بوو بە هەور،**
**نە شێوەی هەبوو، نە لە ئێمە بوو،**
**ئایا تا رادەیەک ناوێک نەبوو؟**

## پەراوێزەکان:

١-"حاشۆواه" وشەیەکی عیبریە (השואה) و بە مانای "تووشیار" (disaster, catastrophe)، یان کارەساتێکی دڵبر دێت. لە زمانە ئەوروپاییەکاندا وشەی "هۆلۆکاوست" (Holocaust) بەکار دەبرێت، کە وشەیەکی یۆنانی کۆنە و بە مانای "تێکڕا سووتاو، بە ئاگر لەنێوچوو" دێت. ئەم واژەیە بۆ ئەو جینۆسایدە بەکار دەهێنرێت کە رژێمی نازی لە جەنگی دووەمی جیهانیدا دژ بە جوولەکان و بۆ لەناوبردنی جوولەکان بەڕێی کرد.

٢-پلانێت بریتییە لە تەنێکی شێوەگردی ئاسمانی کە لەسەر خولگەیەکی دیاریکراو بە دەوری خۆردا دەسوڕێتەوە، بۆ نموونە: زەوی، مانگ، مارس، مێرکوری، هتد...

٣-کشنەستێر، کشنەستێرە: تەنێکی ئاسمانییە، کە لە پاشماوەی سیستمی خۆر پێکدێت و خولگەی (لەدار) بەجێدەهێڵێت و بە سووتاوی و بە کلکێکی گەشەوە بەرەو زەوی دەکشێت.

٤-ئێتەر (عەرەبی: الأثیر): وشەیەکی یۆنانییە بە مانای تەبەقەی سەرەوەی هەوا دێت، کە زۆر تەنک و سووکە. لە زمانی رۆژانەدا ئەگەر شتێک زۆر سووک بێت، لەگەڵ ئێتەر بەراورد دەکرێت. زۆرجار رۆح بە ئێتەر ناو دەبرێت، کە لە جەستەی مرۆڤ دەردەچێت و دەڕوات بەرەو بەرزایی، بەرەو جیهانێکی تر.

# یاخیبوونی ڕەها
## لە ڕۆمانی (ڕاستییە درۆزنەکان)ی
## (گۆران ڕەئوف)دا!



دانا کەمال

ئەلبێر کامۆ، فەیلەسوف و نووسەری فەرەنسی لەبارەی یاخیبوونەوە دەڵێت: مرۆڤ کاتێک یاخی دەبێت، وەڵامێکی نەرێنییانەی (نەخێر)ی پێیە، بەم پێیەش شتەکانی چواردەوری خۆی پێ قبوڵ نییە و دەیەوێت بەو دونیایەی تێیدایە، بڵێت (نەخێر، نا)... هەڵبەت ئەوکاتەی مرۆڤ نیشانەی نەخێر بۆ جیهانێک بەرزدەکاتەوە، لەهەمان کاتدا نیشانەی بەڵێ بۆ جیهان و دونیایەکی تر بڵند دەکات، جا گەر ئەو یاخیبوونە، یاخود ئەو بارە نەرێنییە، یاخیبوونێکی فیکری بێت، یان یاخیبوونێک بێت لە داکەوتەکانی ژیان، یاخود زەنگی نەخێر بێت بۆ عەشق، یان یاخیبوونێکی

سیاسییانه و شۆڕشئامێزانه بێت... هتد، ئەوا لە هەموو بارەکانی یاخیبووندا هۆکارێکی تاقانه و بەهێز هەیە، ئەویش ڕەتکردنەوەی شتێکە لە ئاست شتێکی تردا، قبوڵ نەکردنی دونیایەک لە ئاست دونیایەکی تردا، بەڵام تەواوی جۆرەکانی یاخیبوون لە بازنەیەکدان، یاخود لەژێر ناونیشانێکدان کە ناوی (ژیان)ە!

گەر وردتر سەرنج بدەینە ئەو ڕستەیەی کامۆ، دەبینین مرۆڤ کاتێک تووشی یاخیبوون دەبێت کە وەڵامەکان بەجۆرێک لە جۆرەکان نالۆژیکین و وەڵامگەلێکن کە مرۆڤ توانای ڕازیبوونیانی نییە، ئیدی ئەو چرکەیە سەرەتای بێهودەییەکی قوڵە لەو دونیایەی لێی یاخییە، ئیدی سنوورێک نامێنێتەوە لە مابەینی خۆی و ئەو دونیایەی یاخیبوونەکەی بەرەوڕوو دەکات، چونکە لەو بارەدا ئیدی خودی یاخیبوون دەبێتە بەشێکی فراوان لە مرۆڤ، دەبێتە تێکەڵەیەک لە مرۆڤ و نەخێر!

ئەوەی جێگەی سەرنجە لەنێوان یاخیبوونی ڕەها و یاخیبوونی میتافیزیکی، ئەو خاڵەیە کە وەک جۆرێک لە قوناغبەندی شتەکان ڕوودەدەن، هەرئەوەی کە مرۆڤێک گرفتی لەگەڵ واقیعدا هەیە و ناتوانێت مامەڵەیەکی تەندروست بکات و کردارەکانی نامۆن لە ئاست ئەو دەورووبەری تێیدایە، ئەمە خاڵێکی زۆر بنەڕەتی مرۆڤبوونی خۆی و هاوکات یاخیبوونیشە، چونکە ئەوکاتەی مرۆڤ دەیەوێت خودی خۆی بێت، ئیتر دەسپێکی یاخیبوونەکان دەست پێدەکات، ئیتر سەرەتای شۆڕشە ناوەکییەکانی خۆیەتی، ئیتر لە هەوڵی گۆڕینی پێناسە و ناسنامەی ئەو شتانەیە کە بەریان دەکەوێت، بەتایبەت دوای ئەو ساتانەی کە مرۆڤ ناویان دەبات ژیانکردن، دوای ئەو ئەزموونەی لە بەرەنجامی خودی ئەو دونیایەوە دروست دەبێت کە تێیدا یاخیبوونەکەی دەکات.

سادقی هیدایەت چیرۆکنووسی گەورەی ئێران، لە چیرۆکی زیندەبەگۆڕدا دەڵێت: هەمووان لە مەرگ دەترسن و من لە ژیانی لاساری خۆم! ئەم گوزارشتەی هیدایەت یاخیبوونە لە ژیان، بەواتا زۆر قوڵ و فەلسەفییەکانی، جۆرێکە لە پەڕینە و هەڵاتن لە شتێک کە ناوی خودی ژیانە، وەرگرتنی مەرگە و ڕەتکردنەوەی ژیانە! لێرەدا دەگەینە ئەو خاڵەی کە تێیدا بەر وەڵام دەکەوین لە بێ وەڵامیدا! بەر هیوا دەکەوین لە بێهیواییدا! ئەویش ئەوەیە: ئەوکاتەی مرۆڤ یاخی دەبێت لە خودی ژیان خۆی، دەسپێکە بۆ پەڕینەوەی لە ژیانێکەوە بەرەو ژیانێکی تر کەناوی مەرگە! خاڵی پچڕانی تەواوی بوونی مرۆڤە بە (بوون) خۆیەوە، ئەو چرکەساتانەیە کە مرۆڤ وەک بوونێک توانای دەستخستنی وەڵامەکانی نییە، توانای هۆکارگەلێکی لۆژیکی نییە بۆ مانەوەی لە ژیان، ئەمە لەیەک کاتدا هەم بێهودەییە لە ژیان، هەم دۆخێکە دەکرێت وەک جۆرێک لە شکست مامەڵەی

لەگەڵدا بکرێت، ئەوکاتەی مرۆڤ بێهیوا دەبێت لە تەواوی ئامانج و خەونەکانی، ئیتر پەنادەباتە بەر جۆرێک لە یاخیبوون، ئەویش ئەو یاخیبوونەیە کە کامۆ نیشانی کردووە بە یاخیبوونی ڕەها!

ئەوکاتەی مرۆڤ ناگاتە وەڵامی پرسە جددییەکانی لە ئاست ژیاندا، ئیتر گومان بە جۆرێک باڵادەست دەبێت، زۆرکات بۆ دڵنیابوون لە گومانەکانی دژی ژیان، بە تەنها خودی ئەزموونکردن لە ئاست ژیاند، جەختکردنەوەیەکی ئەقڵانییە بۆ یاخیبوون لە ژیان، بۆیە ئەو چرکەساتەنە، تەنانەت کتێبە ئاسمانییەکانیش ناتوانن گومانە قوڵەکانی مرۆڤ بڕەوێننەوە کە وەک پرس هەیەتی لە ئاست ژیاندا، چونکە مرۆڤ بوونەوەرێکی بەسروشت یاخییە، جا ئەگەربێت و بەر پرسیارە بێ وەڵامەکانی بکەوێت، ئیتر بەسییەتی بۆ یاخیبوونی لە ئاست ژیاندا.

لە یاخیبوون گرنگتر خاڵی دروستبونی یاخیبوونە، یان ئەو هۆکارانەیە کە وادەکات مرۆڤ لە ئاست یاخیبوونەکاندا تووشی ڕامان و پرسیاربێت، یاخود ئەو یاخیبوونانە کامانەن کە پاش تێپەڕینیان، وامان لێدەکەن پرسیار بکەین، وامان لێدەکات بەدوای خاڵ و دەستپێکی نەخێرییەکانیدا بگەڕێن، بگەڕێن بە شوێن ئەو نەخێرییانەدا کە بۆ کام دونیا کردوویەتی؟ یان بەواتایەکی تر لە کام دونیا یاخی بووە، یاخود ئەو بیانووانەی کامەبوون کە پێش یاخیبوونەکەی هۆکار بوون بۆ ئەوەی یاخی نەبێت؟ دەکرێت لە مابەینی ئەم باسەدا و گرێدراو بە ڕۆمانی ڕاستییە درۆزنەکانەوە بەر وێنەیەکی تری یاخیبوون بکەوین، یان بەر ئەو بیانووە خۆشەویستانە بکەوین کە وەک هۆکارگەلێکی لۆژیکی مرۆڤی یاخی خۆی پێ فریودەدا!

ئەوەی گرنگ بێت لێرەدا تیشکی بخرێتە سەر، یاخیبوونی ڕەهایە وەک چەمێک لەو چەمکانەی لەنێو ڕۆمانی ڕاستییە درۆزەکاندا بەریدەکەوین، ئەم ڕۆمانە لە دووتوێی (٢٠٣) لاپەڕەدایە و ساڵی ٢٠٠٩ چاپ و بڵاوکراوەتەوە، بەدەر لە تەکنیک و زمانی گێڕانەوە و ئەو بارە دەوورنییە ئاڵۆزەی ڕۆماننووس زۆر بەوردی و پیشەییانە کاری تێداکردووە، کە خوێنەر لەکاتی خوێندنەوەیدا دەبێت زۆر دەروونگەراییانە لەم ڕۆمانە بڕوانێت، ئەگینا هەر لە سەرەتاوە دەستبەرداری دەبێت و دای دەخەیت، چون لە کۆتاییەکانی ڕۆمانەکەدا بەر ئەو ڕاستییە دەکەوین کە خودی حیکایەتخوان نەخۆشە! نەخۆشییەکی قوڵی دەروونی، بۆیە دەبێت خۆمان وەک خوێنەر لە هەوڵی یەکخستنی ڕوودا و بەریەککەوتنی چەمکە ئاڵۆزەکانی نێو تێکستەکە بدەین، من بۆخۆم باوەڕم وایە ڕۆماننووس زۆر کارامەییانە توانیویەتی چرکە بە چرکە لە هەوڵی دەرخستنی

پەیامە قوڵەکانی رۆمانەکەیدا بێت، هەڵبەت ئەمە بۆ ئەو خوێنەرەی دەیەوێت دەروونییانە بەر ئەم رۆمانە بکەوێت، چونکە گەر وەک رۆمانێکی گشتی لە دونیای ئەم رۆمانە بڕوانین، ئەوا رەنگە بەتەواوی خوێنەر بێزار بکات، بەڵام گەر پەروەردەیەکی خوێندنەوەی دەروونگەراییانەمان بۆی هەبێت، ئەوا وادەکات خوێنەر لە بارە گشتییەکەی رۆمانەکە تێبگات و بەچێژەوە بەشوێن کۆد و فیکرەی بنەڕەتی رۆمانەکەدا وێڵ بێت.

بەدەر لەو فەزا دەروونییەی رۆماننووس کاری تێداکردووە، بۆئەوەی لە فیکر و واتا قوڵەکانی ئەو چەمکانە بگەین، کە لەم رۆمانەدا وەک خوێنەر بەریان دەکەوین، ئەوا پێویستیمان بە تێگەیشتنی هەندێ چەمکی فەلسەفییە، بەر لە خوێندنەوەی رۆمانەکە، بۆ نموونە تێگەیشتن لە چەمکی یاخیبوون، تێگەیشتن لە عەشق وەک چەمکێکی ناواقیعی! تێگەیشتن لەو رەهەندە دەروونییانەی مرۆڤ لە بنەڕەتدا هەیەتی و ناتوانێت وەک پێویست دەریانخات... چونکە بە خوێندنەوەی ئەم رۆمانە بەر پێناسەگەلێکی نوێ دەکەوین بۆ تەواوی ئەو چەمکانەی لەنێو ریشەی رۆمانەکەدا بوونیان هەیە، بەتایبەت عەشق وەک گرێدراوێکی تایبەت لە ژیانەوە و یاخیبوون وەک کردەیەکی دوای کۆتایی بیانووەکان!

رۆماننووس بۆئەوەی پەیامی فەلسەفی خۆی بگەیەنێت، کەسایەتییەکی هێناوە وەک سەنتەری رووداوەکان بەکاری دێنێت، مرۆڤێک کە خاوەن قەیرانێکی قوڵی ژیانکردنە و خوێنەر ناتوانێت بڕیاری پاڵەوانی رۆمانەکەی بۆ دەربکات، هەڵبەت ئەمە لەو کاتەدایە کە تێکەڵییەکی پێگەیی بەهێز هەیە لەنێوان دوو کاراکتەری نێو رۆمانەکە، ئەویش (ئازار و هەناسەی سپی)یە، بەڵام بۆ ئێمە کە باس لە یاخیبوونی رەها دەکەین، دەکرێت ئازار وەک سەنتەری رووداوەکان بێت و جۆرێک لە پاڵەوانبوونی تێدابێت...

هەناسەی سپی و ئازار وەک دوو کەسایەتی یاخی نێو رۆمانەکە دەردەکەون، بەڵام هەر لە سەرەتاوە تێدەگەین، جیاوازییەکی زۆر قوڵ هەیە لەنێوان ئەم دوو کەسایەتییەدا، ئەویش قوڵبینی ئازارە بۆ عەشق و بۆ ئەو ژیانەی بەواتا قوڵەکان لێی یاخییە، ئازار، یاخیبوو لە هەموو شتەکان، یاخیبوو لە تەواوی واقیع، یاخیبوو لە تەواوی ئەو بەرکەوتانەی وەک مرۆڤێک لە ژیانێکی دیاریکراودا بەریان دەکەوێت، لە یەکێک لە قسەکانیدا دەڵێت: "پێویستە جەوهەری ژیان بگۆڕێت، ئەو یاسایانەی مرۆڤەکان دایانڕشتووە بۆ ژیانکردن، نەمێنێت، کۆمەڵێک یاسای پاک هەڵبکۆڵن"ل ١٥٠... لەم دەستەواژە و پەیڤانەی ئازار-ەوە وەک یەکێک لە کارەکتەرە سەرەکییەکانی نێو رۆمانەکە، بەر یاخیبوون دەکەوین لە خودی

ژیان، بەڵام لە گۆشەنیگایەکی واقیعییانەوە، کە کاریگەری فەلسەفەیەکی تایبەتی لە پشتە، ئەو بێزارە لەو جۆرە ژیانکردنە، باوەڕی وایە ژیانکردن بەو چەشنە خۆفریودانە و یاساکان، یاساگەلێکی ساختە و روکەشین، بەڵکو ئەو باس لە ژیانێک دەکات، کە تێدا بۆخۆمان وەک مرۆڤ یاسا لەنێو ژیان خۆیدا هەڵکۆڵین، هەڵکۆڵین دەلالەتە بۆ قسەکردن لەسەر یاساگەلێکی زۆر قوڵبینانە، لەئاست هەموو بووندا. ئازار یاخیبوونەکەی بەتەڵخی باس لێوەدەکات، ئەو ئامانجییەتی جەوهەری ژیان بگۆڕێت، کە ئەمە خواستێکی فەلسەفی قوڵی فەیلەسوفانەیە و جۆرێکە لە مەحاڵ، کە لە روئیای بەشێکی زۆر لە فەیلەسوفاندا بوونی هەبووە... بۆیە ئازار بەدەر لەوەی باس لە یۆتۆپیایەکی مەحاڵ دەکات بۆ ژیان، هاوکات لە هەوڵی دروستکردن یان پەرەپێدانی فاکتەرێکی زۆر واقیعییانەدایە بۆ مانەوە و بەردەوامیدان بە ژیان.

رۆماننووس بەم پەیامانەی دەیەوێت بڵێت، مرۆڤ لە بووندا یەک شتە و خواستی بنەڕەتی هەموو ئینسانەکان یەک شتە، ئەویش گەیشتنە بە دونیایەکی جیاواز و تایبەتتر لەم ژیانە واقیعییەی هەموو مرۆڤایەتی تێدایە، ئەو دەیەوێت بڵێت مرۆڤێکی سادە یەکسانە لەگەڵ فەیلەسوفێک! بەمەرجێک کە قوڵبووبێتەوە بەنێو خۆیدا و گەیشتبێتە خاڵە بنەڕەتییەکانی مرۆڤبوونی خۆی، ئەمە وەک بارە گشتییەکەی پەیامی رۆماننووس، بەڵام گەر بگەڕێینەوە بە ژیان و رووداوەکانی ژیانی ئازاردا، بەر سەختترین بیانوو دەکەوێن بۆ مانەوە، ئەویش ئیشکردنە لەسەر عەشقێک کە هەموو بوونی ژیانی دراوەتەپاڵ، لەم خاڵەدا بەر سەرکێشی و بەسروشت یاخیبوونانەی مرۆڤ دەکەوین، کە وەک ئەوەی لە ژیانیدا قومارێک بکات، دێت و هەموو واتا پوچەکانی ژیان کە لە رێگەی ئەزمونکردنەوە پێی گەیشتووە، دەیداتە پاڵ کردەیەکی مرۆییانە کە لەنێو فەزای ئەم رۆمانەدا پتر وەک بیانوویەک وەهایە، ئەویش عەشقە بەو واتایانەی ئازار باسی لێوە دەکات، کە واتاگەلێکی تایبەت و زۆر دانسقەن لە عەشقدا، هەڵبەت ئازار کە باس لەو عەشقەی خۆی دەکات، دیسانەوە بەر جۆرێکی تر لە عەشق دەکەوین، کە هەگیز لەو واقیعەی تێیدایە بەریناکەوێت، بۆیە خودی ئەو بیانووەشی کە دەیەوێت وەک مرۆڤێک ئیدامە بە ژیانی یاخییانە و قەیراناوییانەی خۆی بدات، بەجۆرێک لە جۆرەکان مەحاڵە! دیسانەوە ئەو وەسف و خەسڵەتانەی دەیداتە پاڵ ئەو جۆرە لە عەشق، وەک ئەدگارگەلێکی مەحاڵ دەردەکەون، یان گەر باس لە دەرەنجامی بەرکەوتەکانی ئەو عەشقە بکەین، کە ئازار خۆی وەک گریمانەکانی پێش قومار باسی لێوە دەکات، دیسانەوە بەم ژیانە ریالیستییە نامۆیە!

ئازار لەکاتی گفتوگۆکانی نێوان خۆی و هەناسەی سپیدا کە باس لە ژیان دەکات، زۆر رەشبینانە و بێهودەییانە دەدوێت لە بەرامبەر ژیاندا، بۆیە ئێمە وەک خوێنەر بەر پووچبینییەکی زۆر قووڵ دەکەوین لە ئەندێشەی ئازاردا، بەڵام ئەوەی مابێتەوە بۆ ئەو، کە لە ژیانکردن بەردەوامە، بوونی عەشقێکە کە وەک بەڵگەی مانەوەی لە ژیان و بەڵگەی سەلماندنی پووچی ژیان تەماشای دەکات، ئەویش گەڕانە بەدوای کەسایەتییەکی نەبینراودا، گەڕانە بەشوێن عەشقێکدا کە لە واقیعدا هەرگیز ئەزمونی نەکردووە، بەڵام ئاشنای تەواوی بوونییەتی، لێرەدا بەر دژبەرییەکی واتایی دەکەوین، کە پەیوەندی بە خەیاڵ و تێڕوانینەکانی ئازارەوە هەیە... ئەوەی جێگەی سەرنجە، مانەوەی رووداوەکانی رۆمانەکەیە بە پشتبەستن بەیەک هۆکار ئەویش سەلماندنی بوون و نەبوونی عەشقەکەی ئازارە، کە وادەکات خوێنەر قوڵبێتەوە بەنێو رستە و وێنە ئەدەبییەکانی رۆمانەکەدا، کە ئێمە نامانەوێت لەبارەی تەکنیک و زمان و بارە ستاتیکییەکەی رۆمانەکەوە بدوێین. ئازار لە یەکێک لە رستەکانیدا و لەو نامەیەیدا کە بۆ هەناسەی سپی نووسیوە، دەڵێت: "هاوڕێم هەناسەی سپی، پێویستە بڵێم ئەو عەشقەی پڕ بەتەمەنم چاوەڕێی بووم، ئێستا لێی بێگومانم کە بوونی نییە! هیچ نەبوو جگە لە دەستکردی خەیاڵی خۆم"ل٢٠٢، ئەوەی وەک بەرەنجامی پەیامی فەلسەفی رۆمانەکە بۆمان دەردەکەوێت لەپاش گەیشتن و نزیک کەوتنەوە لەم رستەیە، ئەوەیە تێدەگەین ئازار چ مرۆڤێکی یاخییە و کام جۆرەیە لە یاخیبووان، تێدەگەین ئازار عەشقەکەی کە وەک گرەوی ژیانکردن و خۆسڕینەوە دایناوبوو، تەنها بۆ فریودانی هەندێک وەسوەسەی مرۆییانەی خۆی بوو، ئەگینا مەحاڵبوونی ئەو جۆرە لە عەشق بۆ ئەو واقیعەی ئازار وەک تەواوی مرۆڤەکان تێیدا دەژیا، جۆرێک بوو لە داوایەکی کۆمیدی! لەبیرمان نەچێت ئەو نامەیەی ئازار بۆ هەناسەی سپی نووسیبو، نامەیەک بوو کە لەپاش خۆکوژییەکی جێیهێشتبوو! هەربۆیە لەو چرکانەی نێو رۆمانەکەدا بەتەواوی مانا بەر ئەو جۆرە لە یاخیبوون دەکەوین کە ئەلبێر کامۆ نیشانەی کردووە بە یاخیبوونی رەها، ئەو یاخیبوونەی ئیدی مرۆڤ تاقە هۆکارێکی بەدەستەوە نامێنێت کە وەک بیانوویەک ژیانی خۆی پێ بەردەوام بکات، ئازار لەوپەڕی بێ هیواییدا مەرگی بە فریادڕەسی هیوا زانی، ئەو بەرلەوەشی بگاتە ئەو ئەنجامە لە عەشقەکەی، یاخیبوو لە تەواوی ئەو واتایانەی دەدرانە پاڵ ژیان، وەڕس بوو لە هەموو بینراوەکانی واقیع، بۆیە لەگەڵ دڵنیابوونی لە پووچێتی عەشقەکەیدا، سەفەر دەکات بەرە و جیهانێکی تر، کە جیهانی مردووان و خۆکوژانە!

ئەوەی لەم خۆکوشتنەی ئازارەوە تێدەگەین ئەوەیە، ئەو بەرلەوەی بەجۆرێک لە جۆرەکان تووشی شکست بێت لە ئاست بەرکەوتەیەکی ژیاندا، خۆی لەخۆیدا مرۆڤێکی یاخی و نائومێد بوو، بەڵام دواتر کە دەگاتە پلەی بێهودەیی لە عەشقەکەیدا، یاخیبوونەکەی قوڵتردەبێتەوە، لێرەدا هەم دۆخی یاخیبوون و هەم دۆخی شکست دەبنە یەک شت، تێکەڵەیەکی قوڵمان بۆ دروست دەکەن لە یاخیبوون.

گەر وردبینەوە لە خۆکوژییە واقیعییەکانی مێژووی مرۆڤایەتی، ئەوا کەم نین ئەو خۆکوشتنانەی وەک ئازار بوون و ئازار وەک ئەوان بووە، هەر لە خۆکوشتنەکەی (هیسکلیف)ەوە، کە بەو هیوایە خۆی کوشت کە مەرگ تێپەڕێنێت و بگاتە دۆزەخ! یاخود خۆکوژییەکەی سادقی هیدایەت کە بە مانای تەواو، بێزار بوو لەو شتەی پێی دەڵێن ژیان! یان گەر لە خۆکوژییەکەی رۆمان گاری وردبینەوە کە بۆئەوەی پیر نەبێت، خۆی دەکوژێت، ئەمە بەدەر لە ڤێرجینیا وۆڵف کە بەردەوام دەیوت: دەنگێک بانگم دەکات! تا دواجار گیرفانەکانی پڕدەکات لە بەرد و خۆی دەخنکێنێت! بەواتای تەواو خۆکوشتن ئەوپەڕی یاخیبوونە و یەک جار ئەزموون دەکرێت لە ژیاندا، خۆکوشتن ئەو پرسیارەیە کە تەنها بە خودی کردەکە دەتوانین پەی ببەین بە واتاکانی!

بۆئێمە ئەوەی جێگەی بایەخ بێت لەم رۆمانەدا، وێناکردنی ئەو چەمکە قوڵەیە بەشێوەیەکی زۆر هونەرییانە، کەوا لە خوێنەر دەکات بگەڕێت بەشوێن واتای نوێ لە یاخیبووندا و لە هەوڵی کردنی ئەو پرسیارانەدا بێت کە تا ئەو چرکانە نەیکردوون... دیوێکی تر لەم رۆمانەدا کە رۆماننووس زۆر بەوردی کاری تێداکردووە، قسەکردنە لەسەر نائومێدی و مرۆڤی نامۆ، کە ئەمە بۆخۆی وەک خوێنەر تووشی جۆرێک لە ماندووبوونمان دەکات، ئەویش تێکەڵاوبوونی چەند دۆخێکی وشک و ماندووکەرە، وەک خودی یاخیبوون و وێناکردنی مرۆڤی نامۆ و نائومێدی و بیرکردنەوەی مرۆڤ گەلێک کە سنووری واقیعییان تێپەڕاندووە، وێنای مرۆڤێکی ماندوو و جەنجاڵمان بۆ دەکەن، لەهەمان کاتدا بە پێوەرەکانی واقیع ئەمانە مرۆڤگەلێکن کە نەژیاون! بۆیە گەر لە پەیڤەکانی ئازارەوە تەماشا بکەین، دەبینین ئەو ژیانی دابەشی دوو جیهان کردووە، ئەویش جیهانی ئاڵۆزییەکان و جیهانی سادەیی بوو، کە ئەم دوو ناوەی وەک کۆد بەکاردەهێنا بۆئەوەی لە تێڕوانینەکانی خۆی وێنا بکات لەبارەی بوونەوە!

شیلەر لەبارەی یاخیبوونەوە دەڵێت: "یاخیبوون مرۆڤ دەهەژێنێت، وا لە مرۆڤ دەکات بازبدات بەسەر خودی خۆیدا"، بەڵام لە گرێدراو بەم باسەوە

دەکرێت بڵێین، وەزیفەی ئەدەب بازدانە بەسەر ئەو سنوورانەشدا کە ناتوانین بە واقیعی پێیدا تێپەڕین، هەرئەوەی لە ڕۆمانی ڕاستییە درۆزەکان-دا بەری کەوتین، ئەو یاخیبوونە ڕەهایەی لە ڕووداوەکانی کەسایەتی ئازارەوە پێیدا تێدەپەڕین، جۆرە بازدانێکە بەسەر داکەوتدا کە هەرگیز مرۆڤ وەک کردەیەکی واقیعی توانای ئەوەی نییە، سنوورەکانی پاش مەرگ کەشف بکات، بەڵام لەم ڕۆمانەدا دەگەینە ئەودیو مەرگ و زۆر لۆژیکییانە ڕۆماننووس توانیویەتی وا لە خوێنەر بکات تا دواساتەکانی ڕووداوەکان بڕوات و بە چێژەوە وشە بە وشە تێپەڕێنێت، گەر بگەڕێینەوە سەر هەمان بابەت، کە هێنانەوەی عەشقە وەک بیانوویەک بۆ مانەوە، ئەوا لەم ڕۆمانەدا توانراوە زۆر هاوسەنگانە کاربکرێت لەو دۆخە دەروونییەی کەسایەتی ئازار بەرجەستەی دەکات بۆمان، ڕۆماننووس کە پاش ئەو هەموو ماوەیە کاراکتەرێک دەهێڵێتەوە و لە ژیان بەردەوامە، لەکاتێکدا بەتەواوی مانا، یاخییە لە هەموو بوون، بەدەر لەو عەشقەی باسی دەکات، تۆ وەک خوێنەر هەست بە ماندووبوون ناکەیت لەوەی کە ئەم کەسایەتییە بەدوای چیدا وێڵە؟! ئەوکاتەشی کە ئازار خۆکوژیی دەکات، دیسانەوە بۆ خوێنەر لە بارێکی هاوسەنگانەی چێژی ستاتیکیدایە، چونکە وەک لە سەرەتاوە ئاماژەمان پێدا، ڕۆماننووس توانیویەتی زۆر دەروونگەراییانە مامەڵە لەگەڵ کەسایەتی و ڕووداوەکاندا بکات... گەر سەیری ئەو نامەیە بکەین کە ئازار لەپاش خۆکوژییەکەی بۆ نزیکترین هاوڕێی بەجێدێڵێت، ئەوا زێدەتر لەو قوڵبینییەی تێدەگەین کە بۆ عەشقەکەی هەیبووە، وەک لە یەکێک لە دێڕەکانیدا دەڵێت: "ئەو کەسایەتییە نموونەییە دانسقەیە، داتاشراوی خواستەکانم بوو، دەمویست لە کەسێکی دیکەدا بەدی بکەم و ناوی بنێم (تەواوکەری خۆم) ئەو خۆشەویستییە مەزنەی خۆمی پێ ببەخشم" ل٢٠٢، ڕۆماننووس لە ڕێگەی ئەم نامەیەوە هەم جەخت لەسەر بۆچوونەکانی ئازار دەکاتەوە، هەم وەک هونەری ڕۆماننووسین دەتوانێت بەشێکی زۆر لەو چاوەڕوانییەی خوێنەر بۆ ڕووداوەکان هەیەتی، هاوسەنگ بکات.

ئەوەی مابێتەوە بۆ ئێمە، ئەوەیە، گۆران ڕەئوف هەرچەندە نووسەرێکی لاوە، بەڵام توانیویەتی بەشێوەیەکی پیشەییانە و زۆر هونەرییانە مامەڵە لەگەڵ نووسینی ڕۆماندا بکات، بەتایبەتی ئەم ڕۆمانە کە بەگشتی لەبارەی زۆر بابەتی ئاڵۆز و قوڵەوە قسە دەکات، گۆران ویستوویەتی لە ڕێگەی ئەم ڕۆمانەیەوە ئاشنامان بکات بە جۆرێکی تر لە یاخیبوون، یاخود لەبارەی پێناسەکانی یاخیبوونی ڕەهاوە شتی نوێمان بۆ کەشف کات، کە ئێمە وەک خوێنەر لەنێو

رۆمانی راستییە درۆزنەکاندا بەریدەکەوین، کە ئەویش تێکەڵکردن و گرێدانی چەند چەمکێکە پێکەوە و قسەکردنە دەربارەی عەشق وەک باگراوەندی بەردەوامی ژیانی یاخیبوویەک!

**ژێدەر:**

-مرۆڤی یاخی، ئەلبێر کامۆ، وەرگێڕانی: ئازاد بەرزنجی.
-رۆمانی راستییە درۆزنەکان، گۆران رەئوف.
-چەپکێک لە شیعرەکانی ژاک پرێڤر، وەرگێڕانی: فەرهاد پیربال.
-چەند وێستگەیەکی فیکری و ئەدەبی، وەرگێڕانی: ئازاد بەرزنجی.
-کیرکە گۆر نیتچە سارتەر، پۆل ستراتێرن، وەرگێڕانی: ئازاد بەرزنجی.
-سادقی هیدایەت لەناو تۆڕی عەنکەبووتدا، زمناکۆ بورهان قانع.
-نەمری بۆ عەشق و مەرگ بۆ ژیان، گۆران رەئوف، گۆڤاری کۆچ ژمارە (١٣).
-خوێندنەوەیەک بۆ رۆمانی راستییە درۆزنەکان، هێمن عوسمان عەبدوڵڵا، رۆژنامەی ئاڵا.
-ئیمیل سیوران، لوتکەی رەشبینیی، عومەر جەلال، سایتی دەنگەکان.

# چرا کچی تاریکاییە
# بۆ منداڵێتی خۆی دەگەڕێ



● لەتیف هەڵمەت

که من دێم

تۆ دەڕۆی

که تۆ دێی

من دەڕۆم

بەڵام ئێمە بۆ یەکدی دەگەڕێین

***

دەڵێم: پەڕتووکێکی سوورە...

داستانی خوێناوی عەشقی منی

تیادا نووسراوە:

دەمت

***

تازە دەزانم
تومەز ئەو کچە پاشایەی کە پوورە رەعنا
لە داستانەکاندا باسی دەکرد و
من خۆشم دەویست
تۆ بووی
***
هەمیشە
لە زەویدا
گوڵدەدۆزێتەوە
باران
کە خۆی رووتدەکاتەوە
لە دوای باران
تارایەک بە خۆیدا دەدات
ناوی لێناوە پەلکەزێڕینە
هەتاو...
***
من و خۆم
لە سەرمدا شەڕیانە وەک:
تاریکی و مۆم
خۆم و من
لە دڵمدا دۆستن وەکو:
ئاوێنە و ژن
***
هەموو ساڵێک
دیوانە شیعرێک
بە مەرەکەبێکی سەوز
لەسەر مەمکی زەوی دەنووسێ
هەور...
***
گوێی تەمومژ دەگرێ و
کۆیان دەکاتەوە



با
قژی گوڵ و گیا را دەکێشێ و
لەژێر زەوی دەریان دەهێنێ
تەومژ
نازانم
باو
تەومژ
دۆستن
یا ناکۆکن



***

دەستی دەریاچەی ئیجە دەگرم و
خەو بە وشکانییەوە دەبینم
لە دۆڵێکدا
لوولاقی ئاوارەیەکی گورگخواردو
دەکەم بە شمشاڵ
کە گەڕامەوە بۆ سلێمانی
پێی دەڵێم
بە دووردرێژی
دیرۆکی تاراوگەکان
بۆ هەمووتان
بگێڕێتەوە...

***

چاوەڕێی هیچ ناکەم
هیچ چاوەڕێم ناکات
لەم تاریکییەدا
خۆم نەبێ

***

ئەگەر نەوی نەبێ
لووتکە لەدایک نابێ
هەردەم قەرزاری نەوییە: لوتکە

ئەگەر تاریکایی نەبوایە
چرامان نەدەئەفراند
هەردەم چرا
کچی تاریکاییە



کاتژمێرەکەم شاردۆتەوە
من کارم بە کاتژمێر نییە
بە درێژایی شەو و رۆژ
سەیری تۆ
دەکەم

***

هۆنراوەیەکی سپی سپی
وەک
وەک
وەک:-

خەڵووز...

زۆرجار کە دەیەوێ
بەدوای کچێکدا بفڕێ
دڵم
ئیرەیی پێدەبات
قاچم

زۆرجار کە دەیەوێ
بێنوێژ بکات
دەمی ژنێک بە ماچ: لێوم
بەغیلی پێدەبات
چاوم

زۆرجار کە سەرنجی
خوا دەدات چاوم
کینەی لێهەڵدەگرێ
گوێم

زۆرجار کە گوێ لە دەنگی
خوا دەگرێت گوێم
جاڕی لێدەکێشێ کەپووم

باشە من ئەم هەموو دوژمنەم
بۆ لە خودی خۆمدا
کۆکردۆتەوە...

تەماشاکەن
لە نێوانی دوو چیادا
پێدەکەنێ
دەشتاییەک
***



نیوەییم لە ئاوێنەکاندا
ونکرد و
نیوەکەی دیم
لە قوتابخانە بەجێما
منداڵێتیم

***

سەرنج بدەی وەکو من
وێنەی هەزاران هەزار ژن
لە بنیا دەدۆزیتەوە
لەتە ئاوێنەیەکی ژەنگن...

***

رۆژێ وەکو دێوانەیەک
دەڕۆمە سەر بەرزترین یاڵ
پەڵەهەورێک
لە زستانێک دەدزم و
بۆ خۆم دەیکەم
بە شاباڵ



هەموو کتێبێک
لە توێیدا خۆی شاردۆتەوە
جەنگێک

***

بە پیری
لەدایک دەبێ
بە منداڵی
دەمرێ: بەفر

***

کە ماچم دەکەی
کەواتا من هەم
کە ماچت دەکەم
کەواتا تۆ هەی

***

من چۆن
لەم قەفەزە ئازادبم
کە ناونراوە منداڵێتی

***

دەیشۆم و ئوتووی دەکەم
هەموو ڕۆژێ
لە کەسی دی ناچێ
لە هەمانکاتدا خۆم نییە
ئێوەیە
دڵم...

***

من وەک ڕەشەبا
یاری لەگەڵ گوڵدا دەکات: دەستم
وەکو دەمی شمشێر
خۆی لە مەمکی کچۆڵان دەسوێ... زمانم
لە هەرکوێ بم چاوەڕێیە
لە ژێر ستیانی ژنێکی دۆست
وەکو مینێک بیچێنم... شیعرێک
لێکدی دەچن
لە فۆنیم و ئەنجامداندا
مین و ماچ
ئاگادار بن کیژێک
لەبری ماچ
نەخاتە توێی لێوتانەوە
مینێک...



# دڵدانەوە...!

ئیدریس عەلی



واز لە ئینجانەکان بێنە
جریوەکان کۆمەکەرەوە
دان رۆمەکە بۆ مریشکەکان
سێبەری درەختەکان گسک مەدە
خەمی چۆلەکەکانت نەبێ
زۆر نامێننەوە
یەک دوو ریقنە دەکەن و دەڕۆن
دڵت لای ماسییەکە نەبێت
کتێبەکە داخە و
جارێ مەیەرەوە سەری دێڕ
چراکە خامۆشکە و
بیر بکەرەوە... بزانە من
چۆن بیر
لە تۆ دەکەمەوە؟

***

تۆ دانیشە و هیچ مەکە
من لەبری تۆ
ئاوی ڕێحانەکان ئەدەم
ناو لە گوڵەکان دەنێم
مانگ دەهێنمە بەر پەنجەرەکە
دەرگە لە ڕووناکیی
ناو قەفەسەکە دەکەمەوە
باخەکە عەترپڕژێن دەکەم
بوکەڵەکان ژیر دەکەمەوە
گوڵدانەکان دەخەمەوە
شوێنی ڕاستینەی خۆیان
خەیاڵە شۆردراوەکان
ئەدەم بەسەر تەنافەکەدا
تۆ هیچ مەکە و
هەموو ئیشە قورسەکان
دانێ بۆ من
تۆ هیچ مەڵێ و
هەموو قسە خۆشەکان
من دەیکەم
هێندەم بەسە
تۆ ئەو ئەرکە بکێشی و
بۆ ئەبەد
چوارمشقی
لەناو دڵما دانیشیت.



***

تۆ سەفەر مەکە و
من لە بری تۆ
هەموو خەونەکان دەبینم
تۆ لێرەبە و
من لەبری تۆ
هەموو ڕێگاکان تاقی دەکەمەوە

تۆ دانیشە و
من لەبری تۆ
سەر بە هەزار کوندا دەکەم
تۆ هیچ مەکە و
من لەبری تۆ
خۆم ئەیەم بەدەم ئاوەکانەوە
تۆ خەم مەخۆ و
ئیشم چییە من شانی ئەدەمە بەر
تۆ هەر خۆت بە و
من ناسنامەکەم دەگۆڕم
تۆ بیر مەکەرەوە و
من لەبری تۆ
بۆی دەچمە ژێر بار.



***
لە هەرشوێنێ بۆنی گوڵ
گمەی کۆتر
خوڕەی ئاو
وژەی با
ترپەی دڵی چۆلەکە
تەپەی باڵی پەپوولە
خشە خشی گەڵا
حیلک و هوڕی جۆگەلە
هەناسەی چیمەنی لێبێت
من لەوێدا
بیرت دەکەم.
***
هەر کات ئەستێرە داگیرسا
مانگ تریفەی لە خۆی تەکاند
بەفر زریکەی بەردایە کۆڵان
باران بە ئەسپایی لەدەرگەی دا
گۆرانی کەوتە هەوای خۆی

**زەختی دڵڕەقی دابەزی**
**فشاری ئەوینم بۆ هات**
**ڕووناکی لە دڵمەوە فیچقەی کرد**
**تۆ هیچ مەکە**
**من خۆم**
**نوقڵانەی خۆشی دەبەشمەوە**
**تۆ هیچ مەڵێ... من خۆم**
**دنیا تێدەگەیەنم...!**



# خەم مەیلی چاوانم ئەکا

● چنوور نامیق



روح دەمێکە وێڵی دوورە و
خەیاڵ لە بارین ناکەوێ
دڵ سەرقاڵی گەمەی درۆ سورەکانمە
بینابیم وێڵی سەرابە
شکانی پێکەکانی شەو
لەسەر دەستم
نیگاکانم زامار ئەکا
روح دەمێکە دەربەدەری سارای رووتە و
قەت لە تەنیایی ناکەوێ
دیسانەوە
رووم وەرزێکی تێکەڵاوە
دەمێ زەردە و تاسەی نمەگریان ئەکا
دەمێ سەوزە و مەیلی پایزەتا ئەکا



دەمێ ژاکاوە و تینوێتی مەستی ئەکا
دەمێ گەشە و لە وشکەڵانەکانی ئەمڕۆدا
خەونی وەفا ئەیباتەوە...
وا سەرلەنوێ
روح تەریکی سبەینێیە و
دڵ لە ڕاڕایی ناکەوێ
لەم بێنە و بەردەی ژیانە
خەم روخسارم ئەسڕێتەوە و
خۆی مەیلی چاوانم ئەکا!

# خەڵوەتگە

مارف عومەر گوڵ



هێندە بێ تۆ بووم،
ئەو دڵە بەردەم مایەوە بۆ خۆم
ئۆخەی ئێستاکە،
یا تۆ لای منی، یا من لەلای تۆم.

قەت بە تەنیا نیم،
لە هەر کۆییەک بم، لە گفتوگۆدام
کە دێم و دەچم،
لە ماڵ بم، لەدەر، هەر لەگەڵ تۆدام.

هێندە ئارامم،
دڵەکەم بۆتە خەڵوەتگە بۆ تۆ
وەک من ئارامی،
یا دڵ بەگڕی، بە کڵپە و بۆسۆ؟

هەرچی وەرزێک بێ،
هەموو ژیانم، تەنیا وەرزێکە
هێند ئاوەدانم،
هەموو وەرزێکم، تێکڕا تەرزێکە.

سلێمانی
٢٠١٢/٧/١٩



# یا غەفار... یا غەفار...!!

حسێن ئەحمەد- فرانس

ژاوەژاوێک لە سەرمایە...
دەنگی خومپارە و ئاسن دێت...
دەنگی هەلا هەلابوونی کەسێک کە بوغزی تەقیوە...
دەنگی نالە نالی بێ ئومێدێک کە غەرغەرە بە زامەکانییەکات.

ڕاوچییەک لەوپەڕی دونیاوە نێچیرەکەی منم...
موسافیرێک داهاتووی جانتاکەی شانییەتی و
تۆ دەڵێیت: یا غەفار... یا غەفار...!!

باڵندەیەک نائاشنا بە ئاسماندا دەڕوات...
دەستێکی نیگەران خۆشبەختیی سەر شووشەیەک دەسڕێت...
دڵم لەوەی کە نیت...
چاوم لەوەی کەنیت بێگانەیە...

ئەشکەنجەی ئەم شارە دڵدارە کانییەتی...
ئەم هەفتەیە بەفر سپی نەبوو،
باران بێ ئەوەی ببارێت رقی لە جادەیە...
گووڵ بێ ئەوەی بەهاری بینیبێت بە خۆی دەڵێت: بەهار جەهانمە

جاروبار سێبەرێک دەبینم، سێبەرێک دەکوژێنێتەوە.
موریدێک دەبینم، دەفڕەنین حاڵی بۆ ناهێنێت...
ژیان زۆر گەورەیە.. بەڵام ئەو باڵانەی بۆ فڕین دەیبەخشیت بچووکن...
بەخشندەیی دونیا فراوانە...
بەڵام بەو باغانە دەمان کوژێت کە خودا دەیەوێت هی ئێمە بن...

هەتاوێکی گەورە، شەپۆلێکی بچووک دەیلەرزێنێت.
مانگ لە خەیاڵیشدا بەختێکی رەشی سپی نەکردووە...!!
پڵنگێک لە جەنگەڵ رایدەکرد.. کۆترێک فیرار ئاسمانی بوو...
شێرێکیش دەناسم بە غروری پادشاکانەوە
کۆیلەبوو بە تاجەکەی خۆی...

کێ دەستی چۆتە گۆزەوە و نەیشکێنێت؟
مرۆڤ گۆزەی خوایە و خۆی لەو کوتەلەدا شاردۆتەوە...
بۆ ئەوەی خودا دەربهێنین... پێویستە ئەم قوڕە،
ئەم گۆزەیە،
ئەم دەغیلە بشکێت...!!

باغەوان نازانێت باخچە عومری چەنە؟
هیچ عاشقێک بیر لە ژماردنی ئەو تیرانە ناکاتەوە کە دەیپێکن...
داهاتووی ئەم سەدەیە زامە...
دایکم تەزبیحکەی دەستی لە شا خۆشتر دەوێ و
نازانێت کە خودا... شەرەفی بەرماڵەکەیەتی...!!

**تۆ بەرەو پاشەڕۆژ لە هەوادا شلیت**
**هیواکانت رووەو بەیانییەبەیت**
**تۆ نازانیت... پاشەڕۆژ تیرێک بوو لە کەوانەکەت رەها بووە...**
**نازانیت... پاشەڕۆژ بەردێک بوو نەیدا لە هیچ...!!**

**بەسەر تەنافەوەم دەنگ دێت...**
**لە باکوورم دەنگ دێت...**
**لە تۆ دەترازێم و دەگەمەوە بە تۆ دەنگ دێت...**
**بەرەوخوا دەڕۆم و شەیتان دەمبات دەنگ دێت...**
**تۆ ئەڵێیت: یا قەهار... یا قەهار...!!**
**بارانەکە دایکرد... دارکاجەکان تەڕبوون**
**یا جەبار... یا جەبار...**
**نەفخی سوور کەسێکی بە هەواوە گلاند...!!**
**نەفخی سوور... کەسێکی لەسەر ئەو ئاوە خست**
**نەفخی سوور خوا هێنای یوحەنا... نەفخی سوور خوا هێنای**
**کاتێکیش کە من لەناو بینایتدا لە ئاسمان جیادەکرێمەوە**
**کاتێک دەمبینیت و لە هەوا جیادەکرێمەوە**
**دەمبینیت و لە تەنیشت بەردێکدا جیاواز مومارەسەم دەکەیت...**
**لێوت بە خەندەیەک لەناو ئەو تەمەدا**
**وەک پێستی بەر چەقۆ دەترەکێت...**



# کۆتری ئاشتی دڵتم پێ بسپێرە

● کەژاڵ ئیبراهیم خدر



(١)

نمە نمە وەکو باران

وەک هەڵوەرینی

گوڵەکانی گەڵارێزانی پاییز

وەک رووباری باخچەی دڵم

دێمە پەرژینی دڵتەوە

تا ئاسۆی خۆرێکی گەش

لە دڵمانا بیێتە هەڵاڵەی خۆشەویستی و

گەش ببمەوە

(٢)

گوڵێت وەک شەونمی بەربەیان

زەوی دڵی خۆی خۆش دەوێت

بەشەرمەوە پێدەکەنێت

ماچی لێوت سپێدەیەکی گەش و

دڵیشت خونچە چرۆیەکی ئاوەدان

(٣)

وەک گوڵی هەنار تەڕیت

وەک کاتژمێرەکەی دڵی دەستم

دەنەخشێنیت جوانی رووبار

مانگیت وەک خەرمانەی تریفە

ماسی دەریایت

لە شەپۆلم نابیتەوە

وەک ئاوازی مۆسیقا

تیشکی گەشیت

(٤)

چرایەکی بۆ شەوانی تەنهایی

فریشتەیت و بەرگی رەشت نەپۆشیوە

نۆتەی دەنگم

بۆ بارانی دڵت لێ دەدات

بارانێکی بۆ دڵی زەوی

تەڕیت وەک کزەی با

ئاسمانیت، پڕیت لە ئەستێرە

شنەی شەماڵیت بۆ ورشەی گەڵا



(٥)

جوانیت لە پەپوولە دەچێت

باخچەیەکیت

بۆ پشووی ئێواران

لە سێبەرما دەبرسیکێتەوە و

دەڵێیت ئاونگی شەونمیت

(٦)

هەتاویت

بۆ تریفەی مانگ

دەڕژێیتە هەناومەوە

لقی گەڵایەکی وەنەوشەیت

بە خۆشەویستیت دەژێمەوە

(٧)

شمشاڵی گەرووی شوانیت

تابلۆی دەستی نیگارکێشی و

کۆترێکی ئاشتی زۆر تورەیت

کە دەواری خۆشەویستیت هەڵدەدەیت

سێبەری ڕێژنەی بارانیت

هەناسەی هێلانەی ژیانیت

(٨)

زریانێکی ناوەختیت

لەسەرخۆشی بەدمەست دەچیت

کە دەریا شەپۆل دەدا

وەرزی خۆشەویستی

لە باخچەی دڵما هەڵدەکا

(٩)

هەوری سپیت

دڵت شەونمی بەیانە و

جوانی ژیان دەنووسییەوە

هەندێک جاریش بەسەر

لاشەی پڕ لە ئازاری مندا

ڕەنگاوڕەنگیت

(١٠)

لە ورشەی گەڵای دار دەچیت

ملوانکەی بۆ گەردنم

ناسکیت وەک ئاوێنەی ڕۆحم

ئاسمانێکی پڕ ئەستێرەی

بەئەسپایی دێیت و دەچیت



# ئەی ئاو



**ئەحمەد حەقناس- بۆکان**

پێش ئەوەی
بەفر بێت و بمناسێتەوە
بە لێومەوە ئەنێ لێو دێت –با-یەک
دەکا ناو دەمم بۆنی تێر
دەگەڕا زەوی بۆ ئاو سەردەمێک
دەیکرد لەگەڵیا چاوشارۆکی زەوی
پێچەوانە ئێستە
زەوی چەن و چەن ساتێکی بۆ خوڕەی ئاو کردۆتەوە
بەڕێوەیە نەناسێ ببوورە کەساسێ
نەبوو کەس خەتای
دەیخوێندەوە هەڵە پیتەکانی شارنەشینی
خۆی خزاندە پاڵ ئێوارەوە بۆ سەرخەوێ
جوڵاندی خۆی کە تا بەیانی چاوەڕوانی بەهاری
دیتنی هاتن جێی بەختەوەری بوو
نەکەوتم ئەم هەموو زەوییە فریای وەک ئاو
کرد دابەش چرکەکانم ناچار
چرکەیەک بۆ دانیشتن لە پرسەی ئەوانداو

چرکەیەکیش خەمەکان بۆ دڵدانەوەی لە منەوە ئەوە
دەیکرد فێری قوتابییەکان خوێندنەوەکانی
سەردانی چیاکان دەچوو باران
ئەوە لە ئەوە
لێک ئەداوە بۆ مردووەکان رەنگەکان ناسینی
فرِینی دەخستە بیری چۆلەکەوە
لە منەوە ئەوە فێری نووسینی ساتە هەڵوەریوەکانی گەڵا بوو
ئەنووسییەوە بۆ گۆرانیبێژەکان ئاوازێکی نوێ ئەگەرِا
ئەوە لە ئەوە
دەپرسی لە ئاوارەی ماچە دزراوەکانی بە لێکۆڵینەوە
تەنیاییەکان
بۆ نزیکبوونەوەی فێستیڤاڵی ئێوارە
داوای لە خۆر کردبەفر بۆ توانەوە
هەورە ئاڵۆزەکان
جەمسەری خستە پشت خۆی خۆر
هاتە خوارێ درەنگە عەسرێک باران
تا بخورێنێ پشتی دەگەرِا بۆ پەنجەیەک شەو
لەولایشەوە
دەخەوێ لە باوەشی زوقمدا سەرما
پەنجەرە کرانەوەی ئاخ پەنجێرە
دەکەم بۆت داوای پاڕانەوە ئاوارە وەک
دەبا کرِنووش لە بەر دەمتا گەرِانەوە تا
چاوەڕوان بە دەنا
دێت بۆت لە ئەستێرە تا قیامەت
وشەم تاقانەی دوا من
رەنگەکان دوا زایەڵەی تۆ
ئەقیژێنێ لەژێر تۆزا کتێب
لە سەری دەنووسێتەوە بیرەوەری مورِیانییە
تابلۆ هەتیو لە کۆڵانی بوم بێزار
ناکەنەوە رووناکم چراکان ئیتر
دروستم کرد بۆ خۆم تابووت دوێنێ



ناشتم خۆم
بەسەر شانی -با-وە مردنم ئەمڕۆ
بینێرە ئیمێلێک
بدەنەوە قەدەری شار بە خۆشییەوە ئەوسا
دەستی خۆی
لە سەفەر پڕین هەموو
لەم هەلاتنە بێزارە بووە خاک
لە تەنیایی پڕین هەموو
نە زریان پێی دەوێرێ و نە شەماڵ تەنیا یەک
پەلە قاژی دیتنەوەیەتی ئاوات
پڕ پڕی پڕین هەموو
هەڵوەرین گوڵێکە لە غەوغا
بەڕێوە رووناکی
نە کوژانەوە ئەناسی و نە تاریک
گەلا پێدەکەنێ و دار سەمای زەردەخەنەیەتی
بەڕێوەیە هەناسەیەک
ئەکوژێ تێدا خۆی سییەکان
دەکات زستان داوەتی هاوین سێو
لە رووتبوونەوەی خۆی دەکات حەیا ئافرەت
ئەنێژێ لە ئاسۆی بەیانێک نهێنییەکانی پیاو
بەڕێوەیە جادەیش نازانم
یا لێ ئەدەرێ جادە
قەرز بکەم لە باڵندە باڵێک ناهێڵێت بۆ
لە -با- فڕینی
کۆ دەکەمەوە قاقاکان
ئەنووسم پێی وشەیەک
لێبووردن بە حەژمەتەکانا هەڵئەواسرێ
یاخیبوونێکی سەرکێش شنە
ئەژەنێ بۆ شەهید مۆسیقا بە دزێوە ئاو
بەلام
بۆ زەوی نەبرد هەواڵی کەس

ئەمەی بۆ من گێڕایەوە باران
ڕۆژی تەریقەتی شەمامە نەماوە
ئەنێرێ بۆ قەڵەمی نووسەر ئیمێلێک
بدوێن هێدی حەزرەکان تا
ئەوە بە تەنیایی فریای ئەم سەرژمێرەیە ناکەوی
لە قەڵەم بکەوێ نەتەوەیەک ئەترسێ
ئێوارەیەک بێتە میوانی خۆکوژی
بە نیشتمانەوە دەکات قاچاخی ناشەرمی
ڕێگر جادەکان بێدەنگ مرۆڤەکان
بە -با-وە ئەنێ گوللە پەنجە
رووبار سوێندی بۆ زەوی دەخوارد
تەنیا هەور بوو نێوانیان شایەت
دەست پەنجەی بۆ هەنارە رژاوەکان درێژ دەکرد
لەم و لەولاوە لە مەزادەخانەیەکدا
گێلاسە بزربووەکان هەڕاج دەکران خاپوور شیوەکان
مەنفا شەڕی ئاڵۆزی خەو
ئاوازی خەفەتە نێژراوەکان دەنگ
سەردەم بورانەوەی رەنگ لە دەست چرکەی شەهید
ناسیاو نییە کەس
دادەهێنم سەرم لای مێرووله
لێرەوە هەیە شارێک ئەوەیش هی تۆیە
ئامادە دەکات بۆ سەفەرێکی نادیار خۆی
لە ئاسمانەوە چاوێکی دایم
لە خنکاوە دووکەڵەکان چاوێکیشی
گەڕاوەتەوە مردن لە پرسی هەنووکە
وەرەو وەرەو
لە بەیانێکی شەقامە پیرەکاندا دیلە پێڵووەکان ئاڵوگۆڕ دەکرێن
گەر
پێکەنین بە خەونێکی ساردەوە شەوی ژوورەکەت جێدەهێڵێ
مەبە نیگەران
دەگۆڕی هەموویان بەخت ڕووداوی

پێکەوە دەچوونە بەراعەتی زەوی ئاو و باران
قاچیان لەسەر رادەکێشا
ئەدۆزییەوە بۆ تەنیایی رێگایەکی تر
بۆ ئەوەی ولاتی تیرۆر نەبێ سەوزایی هاوینی داوەتی ئێوارە خواردنێک کرد
زەمەن و زەمەن رووتاو رووت
چرکەو چرکە رووتی رووتی
ئاو ئەی ئاو ئاو
تۆ تا کەی رووت نابیتەوە.



# داهاتوو،
# بەسەر پشتی کیسەڵەکانەوە



گۆران ڕەسوڵ

دەچینەوە سەر دووڕیانی وەڕەسی
بەدەم گوێگرتن لە هیچ، هەنگاو دەنێین
ئێمە هەر لە خۆمانەوە
پەلەپەلی گەیشتنین،
کەسیش لەوسەری دووڕیانەکەوە چاوەڕێمان ناکا.
لەوێوە
لە هیچەوە بەرەو هیچکوێ
دەست پێدەکەینەوە.

لەدوا لاپەڕەوە کتێبەکان دەخوێنینەوە
ئاوا زیاتر لە نووسەرەکان حاڵی دەبین،

دەگەڕێینەوە بۆ سەردەمی بتپەرستن و
لەڕێی بەردی داتاشراوەوە
ویژدانمان نەرم دەکەینەوە.

**لە دەنگی کەرەوە**
**موزیکی نوێ دادەڕێژین.**
**سپێدە لەگەڵ سوزانییەکان دەکەینەوە و**
**لە میهرەبانی ئەوانەوە**
**فەلسەفەی ئەخلاق دەنووسینەوە.**
**ئاوا وەک ئەوەی خۆمان ویستمان و دەمانەوێ.**

**لە باخچەکانی گوناهەوە**
**هەناری ترشمان دزین،**
**لە تاوان و نەهامەتیشدا**
**هاوتەبا نەبووین و کێبڕکێمان کرد.**

**هەمووان رەنگەکانیان لەنێو خۆیاندا بەشکرد**
**سوور و زەرد و شین و سەوز و مۆر**
**من**
**لەنێوان سپییەتی کۆترەکان و**
**رەشی جەنگەکاندا رەنگێکی خۆڵەمێشیم بەرکەوت.**
**گرینگ نییە**
**من ئەو نەهامەتییەش لە باوەشدەگرم**
**کە لە جیاوازی ئەوانەوە بۆم دێت.**

**دەرگاکان زۆرن**
**گەر لە هەموویان بدەم**
**پەنجەکانم هەڵدەوەرن،**
**پێڵاوەکانیشم**
**بەشی ئەو هەموو رێگایانە ناکەن.**
**سەر لەم هەموو رێباز و یاسایە دەرناکەم**
**هەریەکەو بە ئاوەزی خۆی دەمخولێنێتەوە.**

**گوتیان بگەڕێ**
**گەڕام و هیچم نەدۆزییەوە**

گوتیان بگەڕێ
بڕیارمدا بگەڕێم بەدوای ئەوەی کە نازانم چییە!
بەرلەوەی دەستپێبکەم
کەمێک ژیانم لە ئینتەرنێتەوە داونلۆد کرد
مشتێک حەبی پانادۆڵ و
بوتڵێک وێسکی و قاپێک زەیتوونی سەوزم
خستە ناو جانتای
لە باپیرەمەوە جێماو.

گەڕام
لەناو پاشماوەکانی دوای جەنگ
لە کتێبـی ئەفسانەی گەلاندا
گەڕام
لەناو مایۆ و ستیانی سوزانییەکاندا
لەناو وێنەکانی پڕۆسەی خۆکوشتن.
لەودیو ماسکی سیاسی و سیخوڕاندا
لەپشت کارەساتە مرۆییەکان
لەناو مێژووی فوودراو بە پاڵەوان گەڕام.
لەنێو کتێبە ئاسمانی و زەوینییەکان،



گەڕام و زۆر گەڕام
کڵێسا و مەلهاکان
بارەگای حیزب و ڕێکخراوەکان
شار و دێهاتەکان
ماڵی مرۆڤ و ماڵی خوا
هەموویان ورد ورد گەڕام
شتێکم نەدۆزییەوە
ناوی داهاتووی ڕۆشن بێ.

# لە هەرەسی دەریا و دونیا



● هاوڕێ یوسفی

بۆ دایکم
لەبەر میهرەبانی و شەرافەتی

ڕەنگە یەکم کەسم لە گومانەوە دەست پێدەکات
چما دونیا خیانەتێکە لە گشت مرۆڤەکان ئەکرێ
بڕیار بوو دونیا باڵی مرۆڤەکان هەڵگرێ و
ڕێگە نەدات نوقتەکان هەرەس بێنن
بەڵێ... هەقیقەتی دونیا بوو
(دونیا هەمیشە پەڕانتزێکی هیلاکە)
دونیا زەمینەیەکە بۆ غوربەت
(عەرزێکە ئاخری گشتمانە)
خانم پێویست بوو دونیا زەبوونترین کاکەشان بێت؟
دووریان بوو

به دوو بەرەکیدا کەوتین
دوو دڵی سێوەکانی پێ لەت کردین
دونیا لێوڕێژە لە جادە و کەوش و...
کەوش؟
ئەرێ کەوش/ چەند وشەیەکی ماندووە
هەر کەوش ئەندازەی دونیای لەبەربوو
کەس لە قسەی کەوشەکان تێناگات
هەمیشە کەوشەکان دونیایان پێعەجیبە
تۆ بێژی کەوشەکان تاقەتی کەویر بن؟
چ کات دونیا بیری لە کەویرەکانی کردۆتەوە کە کەوش لەخۆی؟

تۆ هیچ مەڵێ با کەویر هەرفێری سەبووریمان کات
با تەنیا کاروانەکان بزانن کەویر چەنێ تێرە لە خۆی
دونیا تا کوێ ئەگەڕێ؟
بڵێی رێگە بدات پەنجەرەیەک دیاری بکەین؟
پەنجەرەیەک بۆ بینینی ئەو کچانەی هیچکات
نەیانزانی لەدوای ئەوان پیرتر ئەبین
راستە دونیا دەریاوانێکە باوەڕی بە لەنگەر نەماوە؟
ئەرێ قەت دەریامان پێوەنایەت
عەرز ئەزانێت مرۆڤەکان نرکەیان لێوە نایەت
(هەمیشە گشت گیانمان کەشتییە نەوەک رۆژێ لە
دونیا و لە خۆماندا چەند نوقتەی تریش...)
خانم؟ بنووسم؟ چەند نووقتەی تریش بنووسم؟
بنووسم خاک حەشری پێکردین؟
خاک فێری جەنگی کردین؟
خۆ خاک هەمیشە پڕیەتی لە یادگار
یادگار؟
یادگار پێی وتین ئەو کاتەی رەنگی دونیا سارد ئەبێ
ژیان بەرە بەرە کامڵبوونی مردنە
رۆڵە منالی درۆیەکی گەورەیە
دونیا ئێوارەیەکە

**ئێوارەیەکی نارنجی**
(نارنجیتر لەوماڵانەی سەعاتێکیان نییە
دیوارەکانی پێ بسپێرن)
چاوێکیان نییە گریانێکی پێ بسپێرن

هەمیشە گریان کاتی دابڕانی مرۆڤ بووە لەسەر زەمین
بۆیە دونیا شەوێکە هیچ ئەستێرە و ئوستوورەیەکی تیا نییە بۆ دڵتەنگی
(ئاخ خوایە ئەم لاپەڕە چەنێ عەزیەتم ئەکا)
من ئێژم ئەنووسم/ ئەشێ بنووسم
ناتوانم بنووسم/ نازانم بنووسم
دەبێت بنووسم
هەموو شوێنێکی دونیا ماڵی کەوشەکانە
کەوشەکان بڕێکی دونیان
کەس سێحری کەوشەکان تێناگات
دەی با بە کەوشەکاندا بزانین چەنێک دەریا و دونیامان بڕیوە
هەتا دونیا مەنفای هەموومان بێت
چی لە یادگار
چی لە دونیا
چی لە کەوش و کەویر
چی لە هەرەسی نوقتەکان...
راستە جیهان ئاشووبێکە لەسەر ئاو؟
ئاو لە کوێی دونیادا ماتڵە؟
ئاو یانی بەر ماڵ؟
دایکم ئێژێ: بەرماڵ ڕێگەی هەڵاتنی مرۆڤە لەسەر ئەم دونیایە
بەڵێ دەریا هەمووشتێکی دونیا ئەخنکێنێت

ئاو بەتەنیا غەریبترین شتی سەر دونیایە
ئەرێ ئاو نەهایەتی دونیایە
بۆیە؛ (لافاو بێباکترین هێرشە بۆ سەر دونیا)
نۆبەرەی هەناسەکانی دونیا بەسەر ئێوارەکاندا ئەکشێ
کە دونیا پڕبەدڵ بێتاقەتە لە ماڵەکان لە مناڵەکان

خۆ وتم گەنجێتی گەمەیەکی تازەیە
خۆ وتم میوەکان بۆنی خۆیان نەهێناوە

گوناهی ئێمە نەبوون بوو
گوناهی ئێمە سەبووری بوو
بەڵێ: هەمیشە مرۆڤ پاشماوەی جەهەننەم و ئاوە
ساڵێکیان/ مانگێکیان/ رۆژێکیان
کوڕێک لە ئاو و دەریا و دونیا و جەهەننەمدا خنکا
ئەو کوڕەی پێشتر وتمان
(کوڕێکە خوماری مردنە)
لاسارترین گۆرانی سەر زەمینە
بەڵێ، خۆ وتت: (حیکمەتی دونیا ژیانێکی هەراسانە)
باوکم ئێژێ: (هەمیشە دونیا جەبرێکە پڕیەتی لە "ئەشێ")
تکایە: من چەند ساڵە وەیلانم
کوڕەکەی منتان نەبینیوە لە شوێنێکی ئەم شیعرەدا مردبێت؟
بەخوا من و دایکی سەرمان لە دەریا و دونیا دەرناچێ.



# دیدار

**حەسەن نازار**

پاش هەواڵپرسییەکی زۆر، دواجار دۆزیمەوە، ئەو لە شاخ جلی رەش و قژی ماش و برنجی بوو، کەچی لێرە، جلی سپی و سەری رەش بوو، هەرکە گەیشتمە بەردەرگای شوێنی کارەکەی، سووکە کۆکەیەکم بۆ کرد و بە سووکی لە دەرگام دا، بێ ئەوەی سەیرم بکات لەجیاتی وەڵامی سەلامەکەم کە پڕبوو لە تامەزرۆیی و چێژی دیدار، لەژێر لێوەوە گوتی: (ها بڵێ چیتە...)، منیش بە زەردەخەنەوە گوتم (جەنابی...، من نەهاتووم بۆ..)، قسەکەی پێ بڕیم و گوتی: (لەکاتمان مەگرە)، بەبێ مۆڵەت دانیشتم و بەدەم نووسینەوە گوتی: (بەڕێزم. قسە بکە بڵێ چیتە خەڵک زۆر وەستاوە)، بە دەنگی بەرز گوتم : (هاوڕێ گیان تۆ منت لەبیرە کە لە یەک سەنگەردا شەڕمان دەکرد، نا ببوورە ئێمە شەڕمان دەکرد و تۆش برینپێچی، لەبیرتە دوای شەڕ پێکەوە گۆرانیمان دەگوت. قسەی هەمەجۆرمان دەکرد)، سووکە سەرنجێکی دا و گوتی: (ئێ ئێ)، لەوە کەوتمە گومانەوە کەوا بمناسێت، ئاخر شار زەینی مرۆڤ لاواز دەکات، یادەوەریی تێک دەدات، بە کزییەوە گوتم:

(من ناناسیت؟، بەکر ڕەبایە، ئەوەی کە لە شاخ چەندین جار بریندار بووم و تۆ تەداویت کردم، ئەو کاتە تۆ برینپێچی شاخ بوویت پێمان دەگوتیت دوکتۆر)، هەر خۆی تێک نەدا و بە گێڕانەوەی ئەم یادەوەرییانە هەستم بە هیچ گۆڕانکارییەک نەکرد تیایدا، دەتگوت نە بای دیوە و نە باران، بە دەم نووسینەوە سەرێکی لەقاند و گوتی: (ئێ... ئێ... وایە وایە)، منیش لەسەر چەنەبازییەکەم بەردەوام بووم: (کاکە تۆ هەموو جار دەتوت (دەڵێی خوا منی بۆ تۆ ناردووە، هەتیو تۆ بۆ ئەوەندە لەم شەڕانە بریندار دەبیت؟ بۆ نازانیت باش خۆت بشاریتەوە، شەڕ وا نابێت کاکە، دەبێت ئاگات لەخۆت و ئێمەش بێت)، دوای ئەم قسانەش هەموو هاوڕێیان دەیاندایە پێکەنین و ئیتر گاڵتەوگەپ دەستی پێ دەکرد و تۆش لەکاتی پێکەنینا دەتگوت (برادەران بە خوا باوەڕ ناکەم ئێوە جەنگاوەر بن، ئاخر جەنگاوەر و قسەی خۆش و قۆشمەیی کوجا مەرحەبا)، تۆ وات دەزانی جەنگاوەر هەرگیز نازانێت پێ بکەنێت، ئەبێت بگری).

لەدوای هەموو ئەو قسە و یادەوەرییانەش هەر هیچی نەگوت. بێدەنگییەکەی منی کوشتبوو، قسەی پیاوی بێدەنگ و کەمدوو ڕێک وەک قومار وایە، هەرکە زاری کردەوە، یان هەمووی دەباتەوە، یان هەمووی دەدۆڕێنێت، دیسانەوە سەر و دڵم گرتەوە: (ئەها لەکاتی گەڕان و دەرچوونەکاندا، من جگە لە چەکەکەی خۆم کۆڵ و جانتا پزیشکییەکەتم بۆ هەڵدەگرتی و جار جاریش بۆ سوعبەت و بۆ ئەوەی من تووڕە بکەیت بەگاڵتەوە دەتوت (پیاو کەری واشی هەبێت هەرگیز پەکی ناکەوێت و ماندوو نابێت)، ئێمەش هەموو پێدەکەنین و لەجیاتی من فەرماندە تووڕە دەبوو، دەیگوت: (کاکە بەسە عەیب ناکەن، بەخوا ئەم پێکەنین و گاڵتەیەی ئێوە، دەماندا بە قەڵبەی شتێکدا و دوژمن پێمان دەزانێت)، ئیتر ئێمەش دەسبەجێ لەترسا بێدەنگ دەبووین و بە بزەیەکەوە سەرنجمان لەیەکتر دەدا)...

باوێشکێکی قوڵی دا و لەسەر نووسین بەردەوام بوو، منیش هەرچەنەبازیم دەکرد، (چەندە خۆشبوو کاتێک شەوان دادەبەزینە ناو گوند و دادەنیشتین، پۆل پۆل ژن و منداڵ و خەڵک دەهاتن و داوای دەرمان و حەبیان لێدەکردی و ئەوان بەو سادەییە جوانەی خۆیان وایان دەزانی تۆ دوکتۆری. تۆش منت دەکردە فەڕاشی بەردەرگا و دەتوت (بەکر بەسەرە بیانکەرە ژوورەوە)، تۆش هەر بەڕاستی وەکو ئەوان واتدەزانی دوکتۆری و بەهەندێ حەبی ئازارشکێن و تەداوی برینەکانیان ڕەوانەت دەکردن و ئەو خەڵکەش بە پاکی و سادەیی خۆیان کۆڵێک دوعایان بۆ دەکردی، وابزانم هەر نزاکانی ئەوان بوو تۆیان پاراست، دوای ئەوەش کە چارەسەری خەڵکی تەواو دەبوو، بە کترییەک ئاوی گەرم و سابوونی ڕەقی

دەستەکانمان دەشۆری و پاشان خوانێکی چەور و شاهانەمان دەخوارد. کە هیچ یەک لەم خوانەگەورە و رازاوانەی ئەمڕۆ تامی ئەو خۆراکانەی ئەو کاتە نادەن، دوای نانخواردنیش تا کاتی دەرچوون لە گوندەکە، نووقمی نێو کەشی لادێ و قسەی خۆش و یاری و گۆرەوی بازی و کڵاوێن و نوکتە و سوعبەت دەبووین و کاتی دەرچوونیش من جانتاکەم بۆ هەڵدەگرتی و بەر لە خۆرهەڵاتن لە گوند دەردەچووین).

من بۆ دڵدانەوەی خۆم، قاقایەکم دەکرد و دەستەکانم دەکێشا بەیەکدا و دەمگووت (یادی بەخێر، بەخوا رۆژانێکی خۆش بوو)، ئەویش هەر بەبێ جووڵە بە ئەوپەڕی وەڕزییەوە چاوی بڕیبووە کاغەزەکانی بەردەمی و هیچی نەدەگووت، جار جارەش سەرێکی دەلەقاند و بێزاریی سەراپا گیانی داگیرکردبوو، وەکو شتێک پێی عەیب بێت باسی ئەو رۆژانەی بۆ بکەی، یاخود لەبیری کردبن، بەڵام من خۆم باوەڕ ناکەم هیچ کات ئەوەندە فرەڕێس بووبم، لەبیریشم کردبوو بۆچی هاتبووم بۆ دەردەدڵ، یان سەردان و دیدار، بەبێ هۆ هەر لەخۆمەوە قسەم دەکرد، (ئەها بیرم کەوتەوە، بەخوا ئەو رۆژانەش خۆشبوو کە چەند رۆژێک مۆڵەتیان پێ دەداین و دادەبەزینە ناو شارەکانی ئەودیو، پێکەوە حەمامێکی باش و نانخواردنێکی خۆش، هەندێک دەرمانمان دەکڕی و پاش چەندڕۆژ پشوو دەگەڕاینەوە بۆ نێو هاوڕێکانمان لە شاخ و تۆ هەر دوکتۆر بوویت و منیش بەردەستت، ئێستاش نازانم هۆکاری چی بوو کە ئەوەندە من و تۆ هۆگری یەکتر بووین، رەنگە هۆکاری ئەوەبێت کە یەکەم رۆژ هاتیت یەکەم کەس ناسیت، من بووم)، ...

بە کۆکە و پژمەیەکی گەورە منی بێدەنگ کرد، پێدەچوو سەرمای بووبێت، هەموو گیانی سوور هەڵگەڕابوو، لوتی گیرابوو، جارجارە دەستی دەبرد لە پاکەتی کلینیکسەکە پارچەیەک کلینیکسی دەردەهێنا و لوت و دەمی پێ دەسڕی و دەیخستە ناو سەبەتەکەی بەردەمی و دیسانەوە چاوە سوورەکانی بۆ بۆ سەر مێزەکەی بەردەمی شۆڕدەکردەوە، کاتێک ئەو لە جووڵە دەکەوت، دەستم پێ دەکردەوە (ئەرێ بەڕاست کوڕی باش کچە لادێیەکە کە دەتوت سەرکەوین دەیهێنم، هێنات، یاخود نا؟ یان کچێکی شاریت هێناوە، ئا لەو کچانەی کە لە کۆلێژە پزیشکییەکەی ئەم دواییە لەگەڵت بوون؟ منداڵت هەیە، یان نا؟ لەوکاتەوە بەڕاستی بووی بە دوکتۆر هەواڵی کەس ناپرسی، وتم با سەرێکی لێ بدەم بزانم ماوە یاخود نا، کاکە رۆژێکی وایە کەس ئاگای لە کەس نەماوە، نە تێر ئاگای لە برسییە و نە دەوڵەمەند لە هەژار، بیرتە زۆرجار لە شەڕ و کەمینەکاندا قاچمان

دەلکان بە قاچی یەکەوە و دەمانوت: یان دەبێت پێکەوە شەهیدبین، یاخود پێکەوە رزگارمان دەبێت، دواییش پەشیمان دەبووینەوە و دەمانوت تا با جیابینەوە، هەر هیچ نەبێت یەکێکمان رزگارمان دەبێت و هەواڵی شەهیدبوونەکەمان بە خێزانەکەمان دەگەیەنێت. یاخود زۆرجار پێکەوە مژمان لە یەک جگەرە دەدا و بەدەم قسەوە پێکەوە تەواومان دەکرد، نازانم بۆ جگەرە باشەکانی ئێستا تامی ئەو جگەرانە نادەن؟، تۆ هەندێ جار بێزار دەبوویت و دەتوت: بەخوا ئێمە ئاسنی سارد دەکوتین، دواییش پەشیمان دەبوویتەوە)، ویستم بناغەی هەندێ قسە و بیرەوەری تر دامەزرێنم، ئەو هەستا و بەسەر خواحافیزی لێکردم و کاغەزێکی چوارگۆشەیی بچووکی دایە دەستم، منیش ناچار لە ژوورەکەی چوومە دەرەوە و سەرنجێکی کاغەزە بچووکەکەم دا، ناونیشانی دوکتۆرێکی دەروونی لەسەربوو، کە لە بەرامبەریدا بوو، منیش بێ ئەوەی بچمە لای ئەو دوکتۆرە دەروونییە، کاغەزەکەم لوول کرد و خستمە ناو سەبەتەی خۆڵەکەوە و بەدەم چوونە دەرەوەم لەو شوێنە سەرەتا زەردەخەنەیەک کەوتە سەر لێوانم و دواییش بوو بە قاقا، ئیتر نەمدەزانی بە شێتی خۆم پێدەکەنیم، یاخود بە چەرخی رۆژگار، یان بێزاریی هاوڕێکەم.

هاوینی ٢٠١٢



# د. مەولود ئیبراهیم حەسەن:
## ئەفسانە بەقەد ئەوەی کە ڕێگایەکە بۆ ناسینی ڕابردوو، هۆیەکیشە بۆ بینینی داهاتوو

● سازدانی: هەرێم عوسمان

ئەو نالۆژیکییەی لە ئەفسانەدا هەیە، پێتوایە بەشتێکی لۆژیکی پاساودراوەتەوە واتە پاڵەوانێک لە ئەفسانە دێتە ئاراوە کە توانای بێسنوری هەیە، بەڵام پاڵەوانەکە پاساوی ئەوەی هەیە کە پێشتر ئەزیەت دراوە دڵی شکێنراوە بەجۆرێ شکێنراوەتەوە تا هەست بەکەمی خۆی بکات، ئەم کەمییە هانی دەدات بۆ ئەوەی بەم جەشنەی لێبێت، یان وەکچۆن خوا بەفریای هەژاران دەکەوێ ئەوهاش خوا بە فریای خەڵکەکە دەکەوێت؟

ئەم پرسیارە، چەند پرسیارێکە لەنێو یەک پرسیاردا، بۆ ئەوەی بتوانم بە ڕوونی وەڵامی پرسیارەکان بدەمەوە، پرسیارەکان لێکبدەکەمەوە و هەریەکە بە تەنیا وەڵامی دەدەمەوە.

ئەوەی کە باسی- نالۆژیکی ئەفسانە دەکەیت بە لۆژیکی پاساودراوە ناوی دەبەیت! سەرەتا من ناتوانم (لۆژیکی ئەفسانە)کە لۆژیکێکی تایبەتە بە (نالۆژیک!؟)

ناو ببەم، چونکە پێویستە بۆ ناسینی لۆژیکی ئەفسانە، بەدوای تایبەتمەندی ئەو لۆژیکەدا بگەڕێین. لۆژیکی ئەفسانە جیایە لە لۆژیکی-فەلسەفە-و هەر فەلسەفەیەکیش خاوەنی لۆژیکی خۆیەتی. لەنێو دەقە زۆرەکانی ئەفسانە، جگە لە لۆژیکی ئەفسانە خۆی، لۆژیکی زۆر فەلسەفە هەیە. هەندێ جار لەنێو یەک دەقی ئەفسانەیی زیاتر لە لۆژیکێک و فەلسەفەیەک هەیە! هەندێ جار دەقێکی ئەفسانەیی فەلسەفە و لۆژیکی دژ بەیەک لەنێو خۆیدا کۆدەکاتەوە. لەنێو دەقە ئەفسانەییە کوردییەکان. ئەم نموونانە یەکجار زۆرن. هەر بۆ نموونە (ئەفسانەی میرمح) کە ئەفسانەیەکی برا ئێزەدییەکانە و تا ئێستا ئەوەندەی من ئاگاداربم چوار دەقی بڵاو کراوەتەوە. یەکەمجار رەحمەتی (قەناتی کوردۆ) لە سییەکانی سەدەی رابردوو لەگەڵ چەند دەقێکی تری ئەفسانەیی، کە هەر دەقێکی بۆ خۆی چەندین لێکۆڵینەوە هەڵدەگرێت، بڵاوی کردووەتەوە. لەو دەقەی (میرمح) کە دەقێکە وەکو (گلگامێش) باس لە نەمریی و گەڕان بەدوای نەمرییدا دەکات. ئەو دەقە لۆژیکی زیاتر لە ئایینێک و فەلسەفەیەکی تێدایە! هەر لە ئایینی (میهرپەرستی) و (زەردەشتیەت) و (ئایینە ئاسمانییەکان) و هەتا دەگاتە فەلسەفەی (بوونگەرایی). کە ئەمە بۆ خۆی تایبەتمەندییەکی ئەفسانەیە. بۆ لۆژیکی ئەفسانەش، ئەفسانە هەموو لۆژیک و هێزە ئایینی و زانستی و رۆحی و جادوگەری و پاراسایکۆکۆژییەکان و خەیاڵێکی بەرز و کراوە تێکەڵ دەکات و بە شێوەی خۆی (لۆژیکی ئەفسانە)ی لێ دروست دەکات. بۆ نموونە: لە زانستی زەمینناسیی و شوێنەوارناسیی و رووەکناسیی و زیندەوەرناسیی و مرۆڤناسیدا، دەیان ساڵمان پێویستە بۆ ئەوەی یەکێ لەمانە ببن بەبەرد، وەک: دار، هێلکەی دیناسوور، ئێسکی مرۆڤ: کەچی لە ئەفسانەدا سوار بە ئەسپەوە، بە لێدانی (شوور)ێک یەکسەر دەبن بە بەرد!!

ئەم هێزەی ئەفسانە و -ئەم- لۆژیکە ئەفسانەییە، ئەفسانە لە هێزی ئایینی وەرگرتووە. هەر ئەم سوارە بە بەردبووانە. کە ژمارەیان نازاندرێت! بە (ئاوی حەیاتێ) یەکسەر چاک دەبنەوە و بەهەمان شێوەی پێش بە بەردبوونیان دەکەونەوە کار، جا ئەگەر چەند سەعات و چەند رۆژێک بێت، کرابن بەبەرد یان چەندین ساڵ. زانستی زەمینناسیی و سروشتناسیی و مرۆڤناسیی و شوێنەوارناسیی دەمێکە و رۆژانە بەبەردبووی جۆراوجۆرمان دەخاتە بەردەست. لەنێو دەقە ئەفسانەییەکانیش بە هەزاران ساڵە باسی بەبەردبوونی رووەک و زیندەوەر و گیانلەبەر و مرۆڤمان بۆ دەکات. بەبەردبوون لە واقیعدا راستییەکی بەرچاوە، ئەفسانەش بۆ خۆی سوود لەم حەقیقەتە وەردەگرێت، بەڵام زەمەنی بەبەردبوونەکە لەئەفسانەدا جیایە، هەر ئەم زەمەنەش دەیکاتە ئەفسانە.

بۆ وەڵامی بەشی دووەمی پرسیارەکەش، کە دەپرسی پاڵەوانێک دێتە ئاراوە کە توانای بێ سنووری هەیە، بەڵام پاڵەوانێکە ،ئەزیەت دراوەو دڵی شکێنراوەو هەست بە کەمی دەکات و تا کۆتایی پرسیارەکە.

سەرەتا ناتوانین هەموو پاڵەوانەکانی نێو دەقە زۆرەکانی نێو ئەفسانە بەیەک پێناسە! بناسێنین چونکە هەر پاڵەوانەو زەمینەی دروستبوون و سەرهەڵدانی تایبەت بە خۆی هەیە! ئەگەرچی زۆر جار پاڵەوانەکانی نێو ئەفسانەی کوردی دواجار دەبن بە پاشا و کچی پاشاش دەخوازن! ئەگەر ئەنجامەکانی ئەم جۆرە پاڵەوانانە وەکو یەکە! بەڵام، سەرەتا و قۆناغەکانیان لێک جیایە. بۆ نموونە: یەکێ لەوانە- کوڕە کەچەڵەکە-یەکێکیان راوچییە! یەکێکی تر عاشقە، ئەوەی تریان کوڕە بازرگانە، ئەوەکەی تر هەر لە بنەڕەتەوە خۆی کوڕە پاشایە. بەم جۆرە لە رووی کۆمەڵایەتی و چینایەتی و پیشەو لێهاتوویی خۆیان هەریەکە و جیایە لەوەی تر، بەڵام لە ئەنجامدا هەموویان دەبن بە پاشا و کچی پاشا و هەندێجار کچی زیاتر لە پاشایەک دەخوازن. هەربۆیە هۆی بوون بە پاڵەوان لە ئەفسانەدا یەک هۆی نییە! هەروەها قۆناغەکانی بەسەرهات و هۆیەکانی بەکارهێنانیش بۆ گەیشتن بە ئاوات وەک یەک نییە! هەندێکیان پشت بە (عەقڵ) دەبەستن، هەندێکیان بە (هێز) هەندێکیان بە یارمەتی هێز و هۆکارە ئەفسانەییەکان، وەک دێو و جنۆکەو ئەنگوستیلە و هەندێکیشیان بە (رێککەوت) و (بەخت)، کە ئەمانەش هەریەکە و بۆ لۆژیکێک دەگەڕێتەوە، کە جیایە لەگەڵ ئەوەکەی تر.

هەروەها پاڵەوانی نێو دەقی ئەفسانە، ئەگەرچی بەردەوام تاک و تەنیایە! یان وابەرجەستەکراوە، بەڵام نموونەی کۆمەڵایەتی خەڵکە! ئەم راناوی (من) و (تۆ) و (ئەو)ە لەجیاتی (ئێمە) و (ئێوە) و (ئەوان)ە. دواجار پاڵەوان لە ریشەدا پاڵەوانێکی واقیعییە و هەرچەندە بەنێو خەیاڵدا سەفەر بکا و بسوڕێتەوە! دواجار هەر دەگەڕێتەوە نێو کۆمەڵگا. واتە هەر هێزێک بەکار بێنێت و هەر ئامرازێکی ئەفسانەیی بەکاربێنێت و هەر کارێکی ئەفسانەیی بکات و هەر زەمەن و جوگرافیایەکی ئەفسانەیی ببڕێت، ئەو دواجار مرۆڤێکی ئاسایی نێو کۆمەڵگەیەکی ئاساییە، بەڵام هەر ئەم مرۆڤە ئاساییە هیوا و ئاواتی مرۆڤە ئاساییەکان بەدی دێنێت و دەگاتە ئاواتەکانی خۆی کە ئاواتی کۆمەڵانی خەڵکە و ئەم ئاواتەش بە زۆری دەسەڵاتی دادپەروەر و یەکسانی کۆمەڵگا و ئاوەدانی بەردەوام و ئاشتی هەمیشەییە.

لەوەش کە لە دەقە ئەفسانەییەکان، پاڵەوان سیفەت و هێزی خواوەندی هەیە! ئەمە جگە لەوەی ریشەیەکی مێژوویی هەیە، هیوایەکی گەورە و بێ سنووری

مرۆڤیشە لەوەی هێزی مرۆڤ هێزێکی لەبن نەهاتووە و دەتوانێت بەسەر هەموو ئاستەکاندا سەرکەوێت و هەموو قۆناغە ناخۆشەکان ببڕێ و دواجار ئەوە بەدەست بێنێت کە خۆی دەیەوێت. ئەوەی خۆشی دەیەوێت خواستی خەڵکە.

**پاڵەوانە سەرکەوتووەکان لەنێو ئەفسانەدا کێن؟ پێتوایە بەشێکی ئەو پاڵەوانانە تەنیا بوون، واتە جۆرە تەنیاییەکیان ئەزموون کردووە وەک ئەوەی لەنێو فەیلەسوف و زانایەکاندا هەیە؟!**

پاڵەوان لەنێو ئەفسانەدا (مرۆڤ)ە! مرۆڤ بە هەموو ڕەهەندەکانی مرۆڤبوونەوە. پاڵەوانەکانی نێو ئەفسانە لە هەموو گۆشەکانی کۆمەڵگاوە دێن! لەنێو هەموو چینەکان سەرهەڵدەدەن. لە هەموو ئاستێکی عەقڵی و هێزی و جەستەیی و ڕەگەزییەوە پێدەگەن. ئەو پاڵەوانەی لە (گاوانی)یەوە پێدەگات، هیچ جیاوازییەکی نییە لەگەڵ ئەو پاڵەوانەی کوڕە پاشایە: ئەو پاڵەوانەی لە (ترسنۆک) ییەوە پێدەگات هیچ جیاوازی نییە لەگەڵ ئەو پاڵەوانەی کە بە ئازایەتی خۆی پێدەگات: ئەو پاڵەوانەی کە (عەقڵ) بەکاردێنێ هیچ جیاوازییەکی نییە لەگەڵ ئەوەی کە بە (فێڵ و درۆ)دەگاتە مەبەست!

ئەو پاڵەوانانەی کە لە کوڕە کەچەڵی و ناشیرینییەوە پێدەگات، هیچ جیاوازی لەگەڵ ئەو پاڵەوانە نییە دواجار کە لە کوڕە پاشایی و ددان مروارییەوە پێدەگات. دواجار پاڵەوان مرۆڤە! مرۆڤی نێو کۆمەڵگا، کۆمەڵگاش لە هەموو سەردەمێک و لە هەموو جوگرافیایەک ڕەنگاو ڕەنگە.

ئەگەر هەندێکیان دەردی تەنیایی دەچێژن و بەچاوی سوک سەیر دەکرێن! هەموویان وانین. هەندێکیان لە دەسەڵاتی پاشایەتی باوک و بەمیرات بۆ ماوەی دەست هەڵدەگرێت و لە شوانی و گاوانییەوە دەست پێدەکات، دواجار بە ڕەنجی خۆی پاشایەتی بەدەست دێنێتەوە! ئەگەرچی هەندێ پاڵەوان لە ئەفسانە دەردی تەنیایی دەچێژن و سوکایەتییان پێ دەکرێت! ئەوانیش بە مەبەستی تۆڵەکردنەوە، هەوڵدەدەن و دەگەنە ئامانج! بەڵام، مەرج نییە! هەموو پاڵەوانەکان ئاوابن! لە ئەفسانەش هەر پاڵەوانە و بەرهەمی شوێن و زەمەن و باری کۆمەڵایەتی و باری دەروونی خۆیەتی و دەقی ئەفسانەش بەرهەمی کۆمەڵگایە، بۆیە ئەگەرچی پاڵەوانەکانی نێو دەقەکانی ئەفسانە جۆراوجۆرن! هەروەها پاڵەوانیش لەیەک دەقدا کەسایەتییەکی تێکەڵە. تێکەڵە لە گێلی و زانایی، تێکەڵە لە ئازایی و ترسنۆکی، تێکەڵە لە جوانی و ناشیرینی، تێکەڵە لە خێر و لە شەڕ. ناکرێت هەموو پاڵەوانەکانی نێو ئەفسانە بەیەک چاو سەیر بکەین و هەر

پاڵەوانێکیش لەیەک ڕەهەندەوە بخوێنینەوە. چونکە پاڵەوان بەرهەمی کۆمەڵگایەکی ڕەنگاوڕەنگە هەر ئاواش بەرهەمی ڕۆژگارێکی ڕەنگاوڕەنگیشە، واتە لە هیچ دەقێک پاڵەوانی ئەفسانە پاڵەوانێکی تەنیا نییە، هەروەها بە تەنیا بەرهەمی دەردی تەنیاییش نییە. پاڵەوانی ئەفسانە لەنێو کۆمەڵگا دروست دەبێ و کۆمەڵگا دروستی دەکات و هەم خۆشی خۆی دروستدەکات، بۆ نموونە گلگامش ئەگەرچی لە کۆی سیفەتەکانی گلگامش، گلگامشێکی تر نادۆزینەوە! بەلام: لە هەموو زەمەنێک و لە هەموو جوگرافیایەکدا لەناخی هەموو مرۆڤێکدا جۆرێک (گلگامێش)ایەتی هەیە، کێ هەیە وەکو گلگامش ئارەزووی نەمریی نەکات! بەلام،چەند کەس وەکو (گلگامش) گلگامشی نێو داستانە کە بۆ بەدەستهێنانی نەمریی هەوڵدەدات!! کێ هەیە وەکو (فەرهاد)فەرهادی نێو داستانەکە (شیرین)ێکی خۆی نەبێ! بەلام، چەند کەس فەرهادانە کورینگ ڕادەوشێنێ؟! دواجار دەبێت بڵێین: هۆیەکانی بە پاڵەوان بوون. لە ناخی هەموو مرۆڤێکدا هەیە! بەلام،هێندە هەیە! هەموو مرۆڤێک ڕەنجی پاڵەوانانە ناکێشێ! کار بۆ هیوایەکانی ناکات و سەرکێشی ناکات و کورد گوتەنی: مل لە چەقۆ ناخشێنێت.

> **سوودی ئەفسانە، هەمان سوودی تازەترین زانستە، چ زانستی هزری بێت، چ زانستی کارەکی و کردەنی.**

**سوودەکانی ئەفسانە بۆ ئەم سەردەمەی ئێمە چییە؟**

سوودی ئەفسانە، هەمان سوودی تازەترین زانستە، چ زانستی هزری بێت، چ زانستی کارەکی و کردەنی. سوودی ئەفسانە ئەگەر بە لێکۆڵینەوەی زانستییانە بێت و کەسی لێهاتوو و شارەزا کاری تێدا بکات، هیچ لە سوودی زانستی پزیشکی و ئەندازیاری و ئەدەبی و هونەری و زانستی دەروونی... کەمتر نییە هێندە هەیە، ئێمە خۆماڵییانە کارمان لەسەر ئەفسانە و ئەفسانەی خۆمان نەکردووە. ئەفسانە کەرەستەی زۆر بابەتی زانستی لەنێو خۆیدا پەناداوە. کە

ئەو کەرەستانە لە زۆر رووەوە بۆ زۆر زانست سەرمایەن و زاناکانی بوارە جیاجیاکان دەتوانن سوودیان لێ ببینن. زۆر زانست هەیە یەک رەهەندن و تایبەت و داخراون، بەڵام ئەفسانە زانستێکە لەگەڵ هەموو زانستەکانی تر تێکەڵە و سوود بە هەموو بوارەکان دەبەخشێ و دەبێتە هۆی دەوڵەمەندکردن و پێشکەوتنیان، کە ئەمە تەنیا ئەفسانەیە توانیویەتی کۆنترین و زۆرترین بابەت و زانیاری بپارێزێت و لە خۆیدا کۆی بکاتەوە. سەیر کە ئێستا لە جیهاندا چ زانستێک ماوە (ریشە)کەی خۆی لەنێو ئەفسانەدا نەدۆزێتەوە. ئەفسانە بەتایبەت و فۆلکلۆر و کلتوور بە گشتی وەک کەرەستە و شوێنە شوێنەوارناسییەکانە بۆ پسپۆڕانی ئەفسانە و کلتوور، وەک ئەوەی شوێنەوارەکان مەیدان و کەرەستەی زانایانی شوێنەوارناسین بۆ کار و پشکنین و لێکۆڵینەوەی شوێنەوارناسیی، وەک چۆن شوێن و کەرەستە دۆزراوەکانی شوێنەوارە کۆنەکان، جگە لە کۆنی کەرەستەکان زۆر زانیاری دەخەنە دەستی پسپۆڕان، ئەفسانەش بە هەمان شێوە کەرەستەی زۆر و جۆراوجۆر و کۆن دەخاتە بەردەست پسپۆڕانی هەموو بوارە جیاجیاکانی زانستە جۆراوجۆرەکان. ئەفسانە جگە لەوەی زانیاری زۆری کۆنمان دەخاتە بەردەست، هۆیەکیشە بۆ داهێنان، داهێنان لەزۆر رووەوە، هەر بۆ نموونە سەیری جیهانی ئەدەب و هونەر و سینەما و شانۆ و فلیمە کارتۆنییەکان بکە، بزانە کام داهێنان هەیە، پێی لەسەر شانی ئەفسانە نەبێ! بەڵام، هێندە هەیە ئەگەر کورد ئێستا هەست بەم گرنگی و سوودە ناکات. عەیبەکەی لەنێو ئەفسانەدا نییە، هۆیەکەی نەزانی و خەمساردی ئێمەیە. جگە لەتاک، کۆمەڵگە و دەسەڵاتیش لەم ئاست و بوارەدا بێ باکن. ئەگەر نەڵێم پێویستمان بە کۆلێژی تایبەت هەیە، لەم بوارەدا، ئەوا بوونی بەشێک لە کۆلێژی زمان و ئاداب و زانستە مرۆڤایەتییەکان زۆر پێویستە لە ژێر ناوی (بەشی فۆلکلۆر –یان بەشی کلتوور)، یا ئەوەتە (بەشی ئەفسانە) هەیە. ئەفسانەی ئێمە کۆنترین و دەوڵەمەندترین ئەفسانەیە لەجیهاندا، کە پڕە لە بابەتی جۆراوجۆر و بەنرخ، کە هەمووی کاریگەری هەیە لەسەر مێژوو و جوگرافیا و زمان و کلتووری ئەمڕۆی ئێمە. ئەگەر ئەمڕۆ ئێمە لە داهێنانی تازەی جیهانی تەکنەلۆژیا ناتوانین بچینە ریزی وڵاتانی پێشکەوتوو، ئەوا بەدڵنیاییەوە لە دۆزینەوەی زانیاری و کەرەستە کۆنەکان لە بواری ئەفسانە و شوێنەوارناسییدا، لە جیهان لە ریزی پێشەوەین، جا چ لەوە گرنگتر و بەسوودتر هەیە، کە کەرەستە و بابەت و زانستێک میللەتی ئێمە بباتە پێشی پێشەوەی بوارێک لە بوارەکانی ژیان، ئەویش بواری ئەفسانەی و شوێنەوارە.

**فەلسەفەی ئەفسانە چییە؟**

کە دەڵێین (فەلسەفەی ئەفسانە)، نابێت چاوەڕێی ئەوەبین، کە (فەلسەفەی ئەفسانە) یەک بخوێنێتەوە، بەهەمان شێوەی فەلسەفەی زانا فەلسەفییەکان، کە فەلسەفەکە کەسێکی زانا و فەیلەسوف دایڕشتووە و ڕێکی خستووە و لە بەرگێکی فەلسەفی تایبەتدا خستویەتییە بەردەست. بەڵکو فەلسەفەی ئەفسانە لەوەدایە، کە سوود لە هەموو فەلسەفە کۆن و نوێی تەیار و دژبەیەکەکان وەردەگرێت و بەشێوازی ئەفسانەیی خۆی و بۆ مەبەستی ئەفسانەیی خۆی بەکاریان دێنێت و زۆرجار بە پێچەوانەی فەلسەفەکە خۆی. بۆ نموونە فەلسەفەیەکی ئایینی دژ بە ئایینەکە، بەڵام فەلسەفەکە بۆ مەبەستێکی نائایینی بەکاردێنێت. روونتر لە ئەفسانەدا پەرچو و توانای پێغەمبەرێک لە پێغەمبەرە ناسراوەکان بۆ بەرژەوەندی تەنیا کەسێک و بۆ مەبەستێکی نائایینی بەکاردێت، کە هێزەکە هەمان هێزی پێغەمبەرەکەیە، بەڵام کەسێک دەیکات و بەکاری دێنێت کەسێکی ئاساییە، لانی کەم پێغەمبەر نییە! هێزەکەش زۆرجار لەنێو ئەفسانەدا بەدەست کەسێکەوەیە، کە لەسەر باوەڕ و ئایینی پێغەمبەرەکەدا نییە.

جگە لەوە، لە ئەفسانەدا (زانست) و (جادوو) دێو و مرۆڤ، هەردووک وەک یەک، یەک کاردەکەن و یەک ئەنجام دەدەنە دەست. لە ئەفسانەدا، دەتوانین بڵێین فەلسەفەی ئەفسانە فەلسەفەی سەرکەوتن و بردنەوەیە! ئەگەرچی زۆر جار سەرکەوتووی نێو ئەفسانە دواجار مرۆڤە و هێزی خێرە! بەڵام هەر لە ئەفسانەدا جار هەیە دێو و هێزی شەڕیش سەردەکەون و دەبەنەوە، بەهەمان ڕێگا و کەرەستەی کە مرۆڤ و هێزی خێر سەردەکەون. کەواتە فەلسەفەی ئەفسانە، فەلسەفەیەکی تێکەڵە. تێکەڵە فەلسەفەی کۆن و تازە و دژ بەیەکەکان. ئەمەش لە کاروکردەوەی کەسەکانی نێو ئەفسانە، کەسە جۆراوجۆرەکان بەدەردەکەوێت.

**پەیوەندی ئەفسانە و زمان چییە، پێتوایە ئەوەی ئەفسانە لە زماندا دەیکات تەقینەوەی زمان بە دوای خۆیدا دەهێنێت بەوەی هێزێکی زۆر بە وشەکان دەبەخشێت؟!**

زمان لە ئەفسانەدا مەنجەڵێکی رووت نییە تەنیا بابەتی تێدا پاراستراب! زمانی ئەفسانە، زمان و بابەتە لەیەک کاتدا. هونەری گرنگی ئەفسانە، لە زمانی ئەفسانەدایە. هەر زمانیشە گیانی بە ئەفسانە داوە. زمانی ئەفسانە جگە لە دەوڵەمەندی و کۆنی و گرنگییە فەرهەنگییەکەی لە رووی ریشەی وشە و ناوەوە، پڕە لە ئیستاتیکای هونەرەکانی ئەدەب و پڕاوپڕە لە کەرەستە جیاجیاکانی بەشە

جیاجیاکانی دەستوور و ڕێزمانی زمان. کە بۆ لێکۆڵینەوە زمانەوانییەکانی هەر زمانێک پێویست دەکات فولکلۆر بەگشتی و ئەفسانەی ئەو زمانە بەتایبەت مەیدانی کارکردنی زمانەوان و زمانزان و زمانناس بێت. ئەوە هەر هێز و ئەفسوونی زمانی ئەفسانەیە. ئەو بابەتە کۆن و بەسەرچووانەی ئاوا بە گرنگی و بەجوانییەوە پاراستووە. وشە لە ئەفسانەدا، وشەیەکی وشک و یەک ماناو یەک ڕەهەند نییە! وشە لە ئەفسانەدا ڕەهەندی مێژوو و کلتوور و ئایین و جوگرافیا و فەلسەفەی میللەت لە خۆیدا هەڵدەگرێت و دەیپارێزێت. مەخابن لەم ڕووەشەوە ئێمە لێکۆڵینەوەمان لەسەر زمانی ئەفسانە و ئەفسانەی زمانی خۆمان نییە! دەنا ئەفسانە کەرەستە و مەیدانێکی فراوانە بۆ پسپۆڕە بەڕێزەکانی بواری زانستی زمان و زانستی ئەدەب. لە کوردەواریدا مەڕدارەکان دەڵێن:

هیچ گیانلەبەرێک هێندەی (مەڕ) بەسوود نییە، ئەم بەستەزمانە هەر لە (خوری)یەوە تا (کشپلی) هەمووی بەسوودە و هیچ شتێکی بێ سوود نییە، هێزەکەی خاک بەپیت دەکات. لەئەفسانەشدا هیچ شتێکی ئەفسانە نییە بەسوود نەبێت، بەڵام چۆن سوودی لێ دەبیندرێت! ئەوە ئەرکی پسپۆڕە جیاجیاکانی بواری ئەفسانەیە.

ئەفسانە بەقەد ئەوەی کە ڕێگایەکە بۆ ناسینی ڕابردوو، هۆیەکیشە بۆ بینینی داهاتوو. ئەمجارەش دەیڵێمەوە، ئەفسانە بەرهەمی عەقڵی مرۆڤە بەرهەمی داهێنراوی ئاست بەرز، داهێنراوی کۆنترین زەمەن، داهێنراوی بەردەوامی داهێنان.

**تاچەند ئێمەی کورد دەتوانین لە ڕێگەی ئەفسانەوە بیرکردنەوەو کلتووری کورد خۆی بناسینەوە کۆمەڵناسیی کورد تاچەند سوودی لەم بوارەدا وەرگرتووە؟**

لەزانا و کۆمەڵناسی گەورە و ناوداری عێراقی (دکتۆر عەلی وەردی) دەگێڕنەوە، گوتوویەتی: من ناتوانم باسی کەس و کۆمەڵگای کوردی بکەم، چونکە زمانی کوردی نازانم و ناتوانم کلتوورەکەیان بە زمانی خۆیان بخوێنمەوە. ئەوەی ئەو زانایە گوتوویەتی ڕاستییەکی بەڵگەنەویستە. لە دوو خاڵدا پێمان دەڵێت:

١- ناسینی هەر میللەتێک لە ڕێگەی کلتووری میللەتەکە خۆیەوە دەبێت.

٢-بۆ ئەم ناسینە پێویستە لێکۆڵەر کلتووری ئەو میللەتە بخوێنێتەوە و لای کەم زمانی ئەو میللەتە بزانێت.

هەربۆیە ئەو لێکۆڵینەوە گرنگ و زانستییانەی بەڕێز دکتۆر عەلی وەردی لەسەر کۆمەڵگای عێراقی عەرەبی کردوویەتی، لەگەڵ ئەم هەموو پێکچوونەش

که لەنێوان کورد و عەرەبی عێراقیدا هەیە. ناکرێت لێکۆڵینەوەکان رێک و راست لەسەر تاک و کۆمەڵگەی کوردی بە گشتی و کوردی عێراق بەتایبەت، بەڕاست بزانین، چونکە هەر میللەتە و خاوەنی کلتووری تایبەتی خۆیەتی. لێکۆڵینەوەی دروست لەسەر تاک و کۆمەڵگەی کوردی هەردەبێت کەسێکی کورد و پسپۆڕ لە بواری کۆمەڵناسیی و شارەزا لە زمان و کلتووری کوردەوە بیکات. بێ زانینی زمان و شارەزایی کلتووری کوردی، لێکۆڵینەوەی زانستییانە لەسەر کۆمەڵگای کوردی و بۆ ناسینی تاکی کورد کارێکی ئەستەمە.

لەبارەی کۆمەڵناسیی کورد و سوودبینینیان لەم بوارەدا، جارێ من نازانم ئایا بە مانای کۆمەڵناسیی زانستی. ئێمەی کورد کۆمەڵناسیی کوردیمان هەیە؟! کەسێکمان هەیە زانای کۆمەڵناسیی بێت و لێکۆڵینەوەکانی لەسەر کۆمەڵگای کورد و کوردستان بێت؟! وەک ئەوەی رەحمەتی عەلی وەردی و کۆمەڵناسە بەڕێزەکانی تری عەرەب، کۆمەڵگای عەرەبییان خوێندووە و بەدنیایان ناساند، ئێمەش کەسێک یان کەسانی ئاوامان هەیە؟ ئەگەر هەبێ و من نەیزانم! ئەوا عەیبی منە! بەو هیوایەی ئەو عەیبەی من بە راست دەربچێ. ئەوەش بەو مانایە نییە! کە ئێمە کەسانی شارەزامان نەبێ لە بواری کۆمەڵناسیدا. بەڵێ، کەسانی بەتوانا و بەڕێزمان هەیە. کە شارەزای تیورە زانستییەکانی کۆمەڵناسین و کاریشیان کردووە و سوودیشیان گەیاندووە! بەڵام، گرفتەکە لەوەدایە، ئێمە (عەلی وەردی)یەکی کوردمان نییە!! کە کاری لەسەر تاک و کۆمەڵگای کوردی کردبێت و راو خوێندنەوەی تایبەت بە خۆی هەبێت. ئەو کەسەش دروست نابێت، تا کەسێک بە وردی و پشوودرێژی مێژوو و کلتووری کورد نەخوێنێتەوە و زانستییانە و لێهاتوانە نەبێتە خاوەنی تیۆری خۆی. ئەگەر کەسێکی ئاواش پەیدابوو، ئەوا بێشک دەبێت ئەو بەڕێزە گرنگییەکی زۆر بە ئەفسانەی کوردی بدات، لەنێو کۆی کلتوور و فولکلۆری کوردیدا.

**پێتوایە مرۆڤی ئەمڕۆ هێشتا باش توانای کەشفکردنی دەقە ئەفسانەییەکانی نەبێتە دەنا ئەگەر ئەم کارە بکات پێشکەوتنێکی زۆرتر لە هەموو بوارەکانی زانست و تەکنەلۆژیا و کۆمەڵناسیی بەدیدێت؟**

ئێمە کە باسی رابردوو دەکەین، نابێت پێمان وابێت رابردوو و رابردووی نەزانی و تاریکییە! ئێمە-واتە مرۆڤایەتی-هێشتا شتێکی زۆر کەم لە رابردووە دەزانێت! نابێت ئەوەش کە دەیزانێت پێی وابێت راستە! بەشی زۆری زانیارییەکانی خۆمان لەبارەی رابردووەوە، زانیاری تیۆری و گریمانەیە! ئەم زانیارییەش

بەردەوام لەبەردەم گۆڕان و ڕەشکردنەوەدایە. ئەفسانەش خەزنەی دەوڵەمەند و پڕی ڕابردووە! ئەو خەزنەیەش ئەوەندەی کار لەسەر نەکراوە، کە بڵێین تەواوی نهێنییەکانی ئاشکرا بووە. بەشێکی گرنگی ئەفسانە-هێمایە، هێماش لێکدانەوە و بۆچوونی جیاجیا هەڵدەگرێت، ئەگەر لە شیکردنەوەی ئەفسانە زۆر جار شیکردنەوەی هەڵە هەبووە! ئەوا بەردەوامیش لێکدانەوەی جیاجیا بۆ هێماکانی ئەفسانە دەکرێت، ئەم ڕەوشە پێمان دەڵێت: ئەفسانە بەردەوام لە نوێبوونەوەو لە گۆڕاندایە، ئەمەش هێندەی هۆیەکەی کۆنی و دوورەدەستی ئەفسانەیە لە عەقڵی ئێمە، هێندەش گۆڕانی دیدی ئێمەیە بەرامبەر بە ئەفسانە. ژیان بۆ خۆی نهێنییەکی ئاڵۆزە، ئەفسانەش بەرهەمێکی ئاڵۆزی ئەم ئاڵۆزییەیە، بەڵام ئەم نهێنی و ئاڵۆزییە بە مانای ئەوە نییە کە ئەفسانە سوودی لێ نەبینراوە و سوودی لێ نابینرێت. دەکرێت لە هەر زەمەنێکدا بە شێوەیەک، جیا لە شێوەی زەمەنی پێشوو سوود لە ئەفسانە ببینرێت. سەیرکە، ئێمە لەنێو ئەفسانەدا تەنیا (ئاوێنەی دنیابین)مان هەبوو، کە بە هۆیەوە دووری پێ دەبینرا و هەواڵی دووری دەزاندرا، ئەویش ئەوەی کە دەیزانیت تەنیا پاشا بوو! کەچی ئێستا لە سایەی زانستەوە زۆر ڕێگا هەیە بۆ بینینی دوور و زانینی هەواڵی دوور، ئەویش ڕادیۆ و تەلەفۆن و تەلدار و بێ تەل و مۆبایل و سەتەلایت و بەرنامە جۆراوجۆرەکانی ئینتەرنێت. کە بەدڵنیاییەوە لە داهاتوودا و لە سایەی زانست ڕێگای تریش پەیدا دەبن بۆ بینین و بیستن و زانینی ڕووداو و هەواڵی دوور، نامەوێت هیچ بەڕێزێک واتێبگات کە من دەڵێم: ئەوەی زاناکان بە زانست کردوویانە و دەیکەن، ڕێک و ڕاست لە ئەفسانەیان وەرگرتووە. نا.. نەخێر!! بەڵام، هێندە هەیە ئەنجامەکان پێکدەچن. ئەگەر ئەفسانە بەتەنیا هۆیەکی دووربینین و دوور زانینی بۆ باسکردین، ئەوا زاناکان زیاتر لە هۆیەکمان دەخەنە بەردەست، هەر بەم پێودانگە ئەگەر مرۆڤ ئێستا چاو لە هەر کار و ئامێرێکی ئەفسانە بکات و ئێمە لە واقیعدا بە ئەستەمی بزانین و دواجار زاناکان بەزانست چەندین بەرهەمی ئاوامان بخەنە بەردەست، کەواتە دەتوانین بڵێین: ئەفسانە هۆیەکە بۆ پێشکەوتنی زانست و هەمەجۆری ڕێگاکانی پێشکەوتن لە بوارە جیاجیاکاندا، بەڵێ، ئەگەر کەشفی زۆرتری نهێنییەکانی ئەفسانە بکەین. بەرهەمی زۆرتری زانستیمان بۆ بەرهەم دێت. کورد دەڵێت: (قسە قسە ڕادەکێشێ) کەشفی نهێنی ئەفسانەش بەرهەمی زانستی هەمەجۆر بەرهەم دێنێت. ئەگەر ئەم نموونەیە، نموونەی بواری تەکنەلۆژیا بوو، ئەوا بۆ نموونەی زانستەکانی تریش هەر ئاوایە. بە زانستە مرۆڤایەتییەکانیشەوە. کەواتە ئەفسانە نەک بەسوودە! بەڵکو بەردەوام سوود بەرهەم دێنێت و بەرهەمدێنێتەوە.



# کامۆ لە پێگەی فەلسەفەواندا
## "خوێندنەوەیەکی تر"

نووسین: ریچارد کەمپێر
و. بۆ فارسی: خەشایار دەیهیمی
و. بۆ کوردی: عادل قادری

((ئەم وەرگێڕانە بەشێکە لە کتێبێک بە ناوی "فەلسەفەی کامۆ" کە ریچارد کامپێر نووسەر و بیرمەندی ئینگلیزی زمان نووسیویەتی و خەشایار دەیهیمی کردوویەتی بە فارسی و ئامانجیشی بەدەستەوەدانی خوێندنەوە و هەڵکۆڵینێکی تری جیهانی کامۆ بووە لەسەر پێناسەیەکی نوێتر و دژەباو بۆ فەلسەفە و مانای فەلسەفە، کە لەسەر دوو رەهەندی تایبەت و گشتییدا وەستاوە، کە بە رای من بۆ خوێنەر و کتێبخانەی کوردی گەلێک پێویست بووە، بۆیە هەموو کتێبەکەم لە فارسییەوە وەرگێڕاوە و بەم زووانە لە چاپ دەدرێت بەو هیوایەی ئاسۆیەکی تر لە ناسین و خوێندنەوەی کامۆ بۆ خوێنەری کوردی بنەخشێنێت)).

## کورتەیەک لە ژمانی وەرگێڕ

کامۆ یەکێک لەو بیرمەند و نووسەرانەیە کە دەمێکە لە جیهانی ئێمەدا هەڵهاتووە و ناخوازێت ئاوا بێت، ئەگەرچی ئەو بە جوغرافیا و بە کولتوور مەودا و جیاوازییەکی قەبە و زۆری لەگەڵ ئێمەی کورددا هەیە، بەڵام بەم حاڵەشەوە کامۆ بە شێوەیەک لە شێوەکان لە ئێمەدا دەژی. هۆی جیهانگیری و بێ سنووربوونی کامۆ، یان باشترە بڵێم خەمە کامۆییەکان ئەو ناوەرۆک و تێم و مانا وجوودی و بوون ناسانانەیە کە لە سەرەتای چەکەرەی نڤیسارییەوە تاکو کۆتایی ژیانی تراژیکیی هۆنییەوە و بەرگری لێکردن. ناسیاوەتی و پێناسەی ئێمە لە کامۆ زۆرتر لە رۆچنە و رێبازی ئەدەبیاتەوە بووە، نەک خوێندنەوە و شیکاری بەرهەمە هزری و بیرکارییەکانی و نەک سەرەنجدانیش بە ئەو وانە فەلسەفی و ئەخلاقییانەی کە زۆرتر بە زمانی ئەدەب گێڕاوییەتەوە و دایڕشتوون. کامۆ لە ساڵی ۱۹۱۳ لە مۆندۆڤی سەر بە وڵاتی ئەلجەزایر لەدایک بوو، باڵاکردن و پێگەیشتنی کامۆ هاوکات بووە لەگەڵ قاتوقڕی و لەناوچوونی بەشێکی زۆر لە سامان و بوونی مرۆڤایەتی بە دەستی مرۆڤ خۆی، واتە دەسپێکی جەنگی یەکەمی جیهانی، کاتێک لە سێپتەمبەری ساڵی ۱۹۱٤دا باوکی دەکەوێتە بەر خومپارەوە، ئیدی شیمانەی ئەوە زەق دەبێتەوە کە داهاتووی کامۆ ئاقارێکی جیاواز بە خۆیەوە ببینێت. ئەو لە نەمان و لەکیسدان، یان باشترە بڵێم نەبوونی سوپێر ئێگۆ (super ego)یەکی تایبەت و تۆکمە بە ناوی باوک[1] تووشی جۆرێک لە دژوازی و ململانییەکی نەبڕاوە لەگەڵ خۆی و ئەو جیهانەی کە وێنای دەکرد، بووەوە. لە نەبوونی باوکیدا دایە گەورەی، راهێنان و پەروەردەکردنی کامۆ و دوو خاڵۆی کامۆی گرتە ئەستۆ، ئەو هیچ کات نەیتوانی بۆ کامۆ رۆڵی سوپێر ئێگۆ بگێڕێت. ئەم غەیبەتی سوپێر ئێگۆیە لە دواجاردا وا دەکات کە کامۆ بڵێت: لە جیهانی هەنووکەمدا هیچ بۆم فام ناکرێت و پووچی چواردەوری تەنیوم بریا کەسێک ببایە هانیدابام و رایبهێنام تەنانەت لە سۆنگەی داسەپاندنی هێزێکەوە کە هەیەتی، من باوکمم دەوێت. کامۆ جیهان و ئەزموونێک دەژیا کە بۆی غەوارە و "بێگانە" بوو، ئەو رۆڵەی جەنگ و تەنیایی و مەرگ و وجوود بوو. بەگشتی ئەو سەردەمەی کامۆ تێیدا پێگەیی مرۆڤایەتی ئەزموونێکی تاڵ و نەکردە و نەکراوەی تاقیکردبووەوە، ئەو دۆخە جیهانگیرەی رەوشی مرۆیی و دۆخی تاکەکەسی و تایبەتی خۆی وای کرد کە کامۆ نەتوانێت پێمل و کۆیلەی رەهای مەسیحییەت (واتەدین) بێت، بۆیە لە شوێنێکدا دەڵێت: من دڵەڕاوکێ و خەمگەلی مەسیحییانەم

هەیە، بەڵام سرووشتم پاگانییە[٢].

واتە دەتوانین ئەم هەڵوێستەی کامۆ بۆ پێناسەکردنی خۆی ئاوەها لێک بدەینەوە کە مەسیحییەت نەیتوانی داڵغە و خەم و پرسیارەکانی کامۆ بەرسڤ بداتەوە و سارێژیان کات. لە کۆبەندی ئەم ڕووداوانەدا کامۆ لە ساڵی ١٩٣٣دا، واتە ئەو کاتەی پلەی ماستەری لە زانکۆی ئەلجەزایر وەرگرت، تێزی ماستەرییەکەی لەژێر ناوی "میتافیزیکی مەسیحی و فەلسەفەی ئەفلاتوونە نوێکان" پێشکەش کرد.

ئەمە ئەو لایەنەی کامۆیە کە لای ئێمە وەکو زۆربەی ئەو شتانەی کە پێوەندی بە هزر و عەقڵەوە هەیە، بڤە ماوەتەوە و شەقڵی نەشکاوە تاکو لایەن و ڕەهەندی فەلسەفی ئەو باشتر بناسرێت. هەر لە ڕێڕەوی تێزەکەیەوە دەردەکەوێت کە کامۆ سەرەڕای کاریگەرییەک کە لە مەسیحییەت وەریگرتووە، هاوکاتیش دەست دەداتە ڕەخنە و هەڵسەنگاندنی جیددی ئەو میتافیزیکە و لە هەندێک شوێنیشدا دەگاتە سنووری ئینکار و ڕەتکردنەوە، یان خوێندنەوەیەکی نوێوە. سەرەڕای مەسیح، کامۆ لە ماتماتیکزان و بیرمەندێکی وەکو بێلز پاسکال، لە ڕێبازی گنۆسییەکان، لە ئەفلاتوونە نوێیەکان، ئاگۆستێنۆسی قیددیس کاریگەری زۆری وەرگرتووە، ئەمانە بە گشتی لەو بوونخواز و ئیگزیستانسیالیستە دینیانە بوون، کە هێز و توانایی زەمینیان لە هەمبەر ئاسماندا دەگرتە بەر ڕەخنە و هەڵسەنگاندنگەلی پڕ لە ترس و سام و لێوانلێو لە دڵەڕاوکێ. واتە ئەو دڵەڕاوکێ مەسیحییانەش وا کامۆ بەشداری بوو. ڕەنگە بکرێت بڵێم کە کامۆ یەکێک لە ڕچەشکێنەکانی ڕەوتی زاڵی ئیگزیستانسیالیزم و میتافیزیکی دینی بوو کە سەرەنجی مرۆڤی لە بوونیی ئاسمانی پڕخۆش و بێبن و دەنگ گواستەوە بۆ زەمین و هەرێمێکی ناکۆتا و سەرەئاسمانی، کە تێیدا قاڵ و قوو و بێدەنگی و بە دەنگی و کوشتن و ژیان و مان و نەمان پێکیان هێناوە، ئەو بەهەشتی لە ئاسمان گەرەک نەبوو، لای کامۆ "ئەوبەرتر"[٣] بوو کە لە دۆزەخدا[٤] بژی تاکو بەهەشتی بێ دۆزەخ، واتە دوای دۆزەخ لە زەمین ئەزموون بکات بە گوشراویی بڵێم ئەو فیردەوسی ناوێت بێ دۆزەخی، یان دۆزەخێکی مانادراری دەوێت کە ئینسان لێی ڕامێنێت. هەر بۆیەشە دەڵێت پاگانیم.

بە هەموو ئەمانەوە دەیگێڕمەوە کە سەربووردە و باڵاکردنی ژیانی هزری و ڕۆحی کامۆ لە گومانێکەوە دەستی پێکرد و بە گومانێکیشەوە گیرسایەوە: واتە لە میتافیزیکێکەوە بۆ میتافیزیکێکی تر، ئەگەرچی ئەمجارەیان غەیری دینی!

هەڵگوشراوەی ڕێبازی فیکری و ئەدەبی کامۆ پووچ و پووچخوازییە، بەڵام بە پێچەوانەی ئەوەی وا فام کراوە و بەرگری لێکراوە و تەنانەت چەسپاویشە ئەم پووچییە مانایەکی نەرێنی و نێگەتیڤی نییە، بەڵکو جۆرێکە لە دۆزینەوە و داهێنانی میتافیزیکی بۆ رزگاری و داسەکنانی مرۆڤ لە ڕێگەی تێپەڕاندن و تەیکردنی هەرێمەکانی پرسیار و گومانەوە. پووچی لە روانگەی کامۆوە پرسیارگەلێکە کە هەستی و بوون لێی بێدەنگن و هیچ بەرسڤ و وەڵامێکی ڕووناکیان نییە بۆی. واتە بێدەنگ بوونی جیهان لە هەمبەر زایەڵەی پرسیارئامێزی مرۆڤ هەستێک لە پووچیمان پێدەبەخشێت! ئەو پرسیارانەی کە لە فلۆتین[٥]و گنۆسییەکانەوە[٦] تاکو ئاگۆستینۆسی قیددیس[٧] درێژەی هەبووە و لای کامۆ چڕتر بوونەتەوە و ئاسۆی وەڵامخوازی کامۆیان گەش نەکردووەتەوە. بێگومان بەشێکی زۆر لەو هەڵگۆستە و خوێندنەوانە کە لە پووچی کامۆ کراون چەواشە و نیوەچڵن، هۆکاری راستەقینەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئاخێزگە و بەستێنی پووچی لای کامۆ پرسیارئامێزە و لای ئەو خوێندنەوە نیوەچڵانەش خەمۆک ئامێزە، بۆیە لە تێڕوانینی کامۆوە لە ڕێگەی خەمۆکییەوە پووچی نابێتە مایە و بەرهەمهێنەری مەعریفە و گەیشتن بە رزگاری، بەڵکو ئەوە پرسیارە کە سەرپشک و پێشڕەوی ئەو پرۆسیس و رەوتە رزگاریکەرەن، تەنانەت ئەگەر دواوێستگەکەشی خەمۆکی بێت بەدڵنیاییەوە یەکەم وێستگەکەی پووچی، خەمۆکی نییە، بەڵکو پرسیارانێکە دەشێت بەرەو خەمۆکی "بجوێن"[٨]. ئەو بە جاروبار گوتوویەتی کە فامکردن و تێگەیشتن لە پووچی دەبێتە هۆی رزگاری و ئەوەش بۆی بەبایەخ و گرینگە بە وتەی خۆی بەدواداهاتەکانی پووچییە، نەک خودی پووچی. بە خوێندنەوەی من پووچی لای کامۆ، یان باشترە بڵێم میتافیزیکی پووچی لای کامۆ دەکرێت لە رۆچنەی سێیانەیەک (تریۆلۆژی) لە بەرهەمە ئەدەبییەکانییەوە وێنا بکرێت. واتە سیمای جیهانی پووچیی کامۆ لە داوێنەوە بەرەو لووتکەی سێ بەرهەمی ئەدەبی نیگار دەکەم. یەکەمینیان رۆمانی بێگانەیە کە تێیدا مرۆڤ، پووچی جیهان فام دەکات و لەناویدا دەژی و باش باش هەڵیدەلووشێت. لەم قۆناغەی سەرەتادا کاراکتەر، نەک پاڵەوان (ئەدەبی مۆدێرن لە مەرگی پاڵەوان و شاکەس و قارەماندا زەمینی بوونی وجوودی هێناوەتە ڤەگێڕاندن لای کامۆش پاڵەوان بوونی نییە، ئەوەی هەیە هێمای مرۆڤێکی تەنیا و تاقانەیە کە لە بەرەهووتی حەقیقەت[٩]دا باوەجەڕەیەتی[١٠]) کەشف دەکات، کە وجوودی ئەو بۆشاوییە و لە ئامێر و وزەی پڕکردنەوەی ئەم بۆش و بەتاڵییە دەگەڕێت. دووەمینیان رۆمانی

تاعوونه، که مرۆڤ به فامکردنی پووچی، ناچاره لەگەڵیدا رووبەڕوو ببێتەوە و بەدواداهاتەکانی له چەشنی تاعوون وەکو پەتایەکی هەمەکی و جیهانگیر ئەزموون دەکات و له بازنەی کارەساتاوی دۆخەکەیدا تێدەگات، که تەنیا و تاق دەمێنێتەوە. لێرەدا کاراکتەری پووچئاخێڤ دەدۆزێتەوە، که گەڕان بەدوای بەرسڤی پرسیارە وجوودییەکانی هەڵگری تراژیدی و ئەگەری سامناکی زۆرە و به راستەقینانە تێدەگات بوون کایەیەکی بوونەوەرانە نییە، بەڵکو جیدییەتێکی دڵەڕاوکێیانەیە که له بوونەوەرە وجوودخوازەکاندا دێتەکایەوە تا کەوشەنی نابوون و عەدەم و هەبوون به نابوونەوەر دەخزێت. سنیەمینیان رۆمانی مرۆڤی یاخییە که مرۆڤ تێیدا به فامکردن و رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ بەدواداهات و راستەقینەی بوونی کارەساتاویی پووچی (تاعوون) و بینینەوەی تاق و تەنیایی خۆی رێباز و رێگەی یاخیبوون دژی هەموو ئەو شتانەی که جیهان له بوون و مانا بەتاڵ دەکەنەوە، دەگرێتە بەر، تەنانەت یاخیبوون دژی مرۆڤ خۆیشی. واته ئەم قۆناغه سەرەتای فامکردنی گەڕان بۆ ئاڵتێرناتیڤێکی میتافیزیکی و بینینەوەی شاڕێگەی وەستان له بەرەهووتی حەقیقەتدایه. ئەو لەم قۆناغەدا ئیدی بێدەروەست و بێگانه نییە، بەڵکو دەروەستی و چالاکڤانیی ئەخلاقیی حەقیقەتی وجوودیەتی. بێگومان ئەگەر به وردی سەرنجی ئەم سێیانەیەمان دابێت، رەوت و گەشەی مرۆڤ وەکو چەشنێک (نوع)ی بوون ئاوەهایە: له بوونەوەرێکی بێگانه و غەوارە به دنیا و بێدەربەست به رووداوەکان بەرەو بوونەوەرێکی ئەخلاق خواز و کەسێک که له هەمبەر کارەسات و هەڵوێسته ئەخلاقی و رووداوە گرینگەکاندا له رووی ئەخلاقییەوە خۆی به بەرپرس دەزانێت، رووخسار دەگۆڕێت. سەرەڕای ئەمانەش شتێکی دیکه که دەبێت باسی لێوە بکەین، ئەمەیه که به گشتی ژیانی ئالبێر کامۆ هەڵکەوتوو له دۆخ و رەوش و سەردەمێک بوو که بکەوێتە ناو ملململانێیەکی قووڵ و جیددی لەگەڵ بوونی خۆی و دیاردە و کەسانی دەوروبەریدا، واته کەسانی وەک خۆی لەوانە: ژان پۆل سارتەر و سیمۆن دۆ بووار و به گشتیتر بازنەی رۆشنبیرانی پاریس لەو سەردەمەدا. ئەو جیاوازییە ئایدۆلۆژی و فیکرییەی که له هەمبەر رووداوەکانی ئەو سەردەمەدا (هێرشی بەرەی رزگاری ئەلجەزایر بۆ سەر ئەورووپاییەکانی دانیشتووی ئەلجەزایر، ململانێی دووجەمسەری کۆمونیزم و کاپیتالیزم و...) لەنێوان کامۆ و سارتەردا بەرجەسته بوونەوە، وایکرد که ئەو "دووانه" دوای گۆڕینەوەی چەند نامەیەکی توندوتیژ بۆ هەتاهەتایه هاوڕێیەتییان

کۆتایی پێ بێت، بەڵام لە سێیەمی جێنیوەری ساڵی ١٩٦٠دا کە کامۆ بە رووداوی ترۆمبێل گیانی لەدەست دا، سارتەر لە شیوەننامەیەکدا ئاوای چڕی: "ئالبێر کامۆ ساماندارى ئەمرۆیی ئەو زنجیرە دوورودرێژەی ئەخلاق خوازان بوو کە رەنگە سەرەکیترین شتەکان لە ئەدەبیاتی فەرەنسادا هی ئەوان بێت". کامۆ لە شوێنێکدا وتبووی کە هیچ شتێک ریسواتر لە مەرگی منداڵێک و هیچ شتێکیش گەلحۆیانەتر لە مەرگ بە رووداوی ترۆمبێل نییە. پەرچەکرداری دایکی کامۆ لە هەمبەر مەرگی ئالبێردا ئەوە بوو کە فەرمووی: ئەو زۆر گەنج بوو.

### رۆژژمێری ژیانی کامۆ

١٩١٣ لەدایکبوون لە وڵاتی ئەلجەزایر.

١٩١٤ کوژرانی باوکی لە بەرەکانی شەڕی یەکەمی جیهانی.

١٩٣٠ رۆژنامەنووسی بۆ رۆژنامەی ئالجێر ریپۆبلیکەن و ماوەیەک دواتر چوونە حیزبی کۆمۆنیستەوە.

١٩٣٣ وەرگرتن لە زانکۆ و تەواوکردنی قۆناغی ماستەری و دواتر پێشکەشکردنی تێزی ماستەری لەژێر ناوی "میتافیزیکی مەسیحی و فەلسەفەی ئەفلاتوونە نوێکان".

١٩٣٧ کامۆ بەهۆی پشتیوانیکردن لە رادیکاڵە عەرەبەکان کە بۆ دیاریکردنی چارەنووس و مافی کۆمەڵایەتی و مەدەنی خۆیان تێدەکۆشان، لە حیزبی کۆمۆنیست دەرکرا.

١٩٤٢ بڵاوکردنەوەی رۆمانی بێگانە.

١٩٤٣ چوونە ناو بۆ ریزی بەرەی خۆڕاگری فەرەنساوە لە هەمبەر داگیرکارییەکانی ئاڵمانی نازییەوە و ماوەیەک دواتر بوو بە سەرنووسەری رۆژنامەی نهێنی کۆمبات.

١٩٥١ بڵاوکردنەوەی رۆمانی مرۆڤی یاخی.

١٩٥٧ وەرگرتنی خەڵاتی نۆبڵ بە دوودڵییەوە، چونکە باوەڕی وابوو شایانی ئەو نییە، بەڵکو شیاوی ئاندرێ مالرۆیە.

١٩٦٠ مەرگی کامۆ بە رووداوی ترۆمبێل.

***

**بێگانە**

**الف. خوێندنەوەی فەلسەفی بێگانە.**

رستە دەسپێکەکانی رۆمانی بێگانە لە ناودارترین رستەگەلی ئەدەبیاتی سەدەی بیستەم دێنە ئەژمار: ئەمڕۆ دایە مرد. رەنگیشە دوێنێ، نازانم. لە خانەی بەساڵاچووانەوە تەلەگرامێک گەییشتە دەستم: "دایە مرد. ناشتن سبەینێ. لەگەڵ رێز". ئەمە هیچ مانایەک نادات. رەنگە دوێنێ بووبێت. (بێگانە، ٣).

راکێشەری و کاریگەری زۆری ئەم چەند رستە کورتە لەوەدایە کە هەستێکی کتوپڕ و راچڵەکێنەر لە هەمبەر بێگانەیەک لە ئێمەدا شین دەکات، کە لەگەڵیدا رووبەڕووبووینەتەوە. وشەی فەرەنسی "دایە"، وشەیەکە کە منداڵان بۆ قاوکردنی دایکان بەکاری دەهێنن، بەم پێیە کە رستەی یەکەم شێوازێکی خۆمانی هەیە. لەم رستەیە دەردەکەوێت کە "بێژەر" لەگەڵ دایکیدا هاوڕێ و تەبا بووە و وا دەنوێنێت نەبوون و لەکیسدانی خەمگین و خەمۆکی کردووە، بەڵام رستەی دووەم شتێکی بەتەواوەتی جیاواز دەدات بەدەستەوە. رستەی دووەم سەرنجمان لە خودی مەرگ بەرەو مێژووی مەرگ دەگەڕێنێتەوە. باقی رستەکانی تریش هەر جەخت لەسەر ئەم هەستە دەکەن. بێژەر زۆرتر لە فەرمانبەرێک دەچێت کە سەرقاڵی لێکدانەوەی مێژووی مەرگ بێت، نەک وەکو رۆڵەیەک کە رەشپۆش و داخداری مەرگی دایکیەتی. هێنانی تەلەگرامی خانەی بەساڵاچووان لەم بەشەی دەسپێکدا، تا رادەیەک بە گاڵتەجارییەوە ئاماژەیەکە بۆ شێواز و ستایلی تەلەگرامیانە ی بێژەر (گوێندە): رستەگەلی کورت و لە یەک هەڵبڕاو. زۆربەی کات، تەلەگرامەکان بەکەمترین ئاستی دەربڕینی وشەوە، دەنووسرێت، چونکە بەپێی زۆریی و کەمیی وشەوە نرخ (پار)ەکەی دیاری دەکرێت. بێژەری ئەم رۆمانەش هەر بەهەمان شێوازی تەلەگرامییانە لە دەربڕینی وشەکاندا دەم قووچاو و چاوچنۆک دەنوێنێت. هەر بەهەمان شێوە کە ژان پۆل سارتەر لە پێناسەکردنی کتێبەکەی لە ساڵی ١٩٤٣دا بەبیرمان دێنێت، رستەکانی ناو بێگانە هەرکامەیان دوورگەیەکن.

وەگێڕی (راوی) رۆمانی بێگانە کێیە؟ رۆمانەکە کە بەرەوپێشەوە دەچێت، وردەوردە بۆمان دەردەکەوێت کە بێژەر، یان وەگێڕ لاوێکی سەڵت و قەیرەیە کە لە وڵاتی ئەلجەزایردا دەژی و فەرمانبەری کۆمپانیایەکی گچکەیە. دەزانین کە نازناوی بێژەر مۆرسۆیە، بەڵام هەرگیز بۆمان دەرناکەوێت کە ناوی بچووکی چییە. لە رابردووشی شتێکی ئەوتۆمان دەست ناکەوێت. تێدەگەین کە باوکی خۆی نەبینیوە و تا سێ ساڵیش بەر لە مەرگی دایکی، لەگەڵیدا پێکەوە لە بینایەکدا

ژیاون. دەڵێت: لە کاتێکەوە پێملی ئەوە بووە کە دەست لە خوێندن هەڵگرێت خەون و خولیاکانی لەکیس داوە. هەرچەندە ئەم قسەیەی بۆ فامکردنی بێدەربەستی ئەو لەمەڕ داهاتوویەوە بەس نییە. هەروەها دەڵێت کە سەردەمێک لە پاریس ژیاوە. بێجگە لەم چەند شتە کورتانە نەبێت، ئیدی لە ساڵگەلی پێش مەرگی دایکی شتێکی ئەوتۆ بە ئێمە ناگوترێت و ئەم سات و ساڵانە بۆ ئێمە لێڵ و تەماوی دەمێننەوە.

ڕۆمانەکە لە دوو بەشی تا ڕادەیەک هاوسان، پێکهاتووە. بەشی یەکەم لە شەش کەرت پێکهاتووە، بەشی دووەم لە پێنج کەرت. بەشی یەکەم لەخۆگری یازدە ڕۆژە، بەئاگاداربوونی مۆرسۆ لە مەرگی دایکی دەست پێدەکات و بە کوژرانی پیاوێکی عەرەب لە ڕۆخی زەریادا کۆتایی پێدێت. بەشی دووەم یازدە مانگ لەخۆ دەگرێت، کە بە لێپرسینەوە لە مۆرسۆ لە پۆلیسخانەوە دەستپێدەکات و بە تێڕامانەکانی سەبارەت بە پووچی، کاتێک کە لە زیندانی تاکەکەسیدا چاوەڕوانی ئەوەیە ئایا سزای ئیعدامەکەی دەگۆڕێت یان نا، کۆتایی پێ دێت. لە بەشی یەکەمدا ڕەوتی ژیانی ڕۆژانەی مۆرسۆ بۆ ئێمە ڕوون و ئاشکرا دەبێت. دەخوات، دەخەوێت، جگەرە دەکێشێت و لە فەرمانگە ئیش دەکات. ڕۆژانی پشوو، یان دەچێت بۆ ڕۆخی زەریا، یان لەسەر بانیژەی ماڵەکەیەوە چاو لە ڕێبواران دەبڕێت. زۆر قسە ناکات و کاتێک دێتە دوو، هەمیشە ڕاست و ڕەوان و ئاشکرا ئەو شتەی کە بیری لێدەکاتەوە دێنێتیە زار. لەم ڕووەوە مۆرسۆ لە ئالسێست (Alceste)ی ناو شانۆنامەکەی مولێر واتە، خەڵک بێز (Themisanthrope) دەچێت، بەڵام ئالسێست بە ئەنقەست ڕاستی و ڕوونیی هەڵبژاردووە، چونکە بۆ ئەو وەکو پرەنسیپ وایە، لە حاڵێکدا مۆرسۆ خۆی لە خۆیدا بەو چەشنەیە. مۆرسۆ لە ئاست خەڵکدا ئەو شتەی وا بیری لێدەکاتەوە دێنێتە زار، نەک بۆ ئەوەی لە ڕووبەڕوویاندا بوەستێ، یان خەمناکیان بکات، بەڵکو لەبەر ئەوەی نایەوێت ڕەنجی ئەوە وەبەر خۆی بدات کە بێجگە لەمە شتێکی دیکە بکات. تەنانەت کاتێکیش کە بەرژەوەندیشی لەوەدایە کە درۆ بکات، یان هەموو ڕاستییەکە نەڵێت، هەمدیس باوەڕەکەی ناشارێتەوە. مۆرسۆ زۆر کەم بیر لە ڕابردوو، یان داهاتوو دەکاتەوە. ئەو ڕۆژگاری ژیانی بە هەمان شێوە کە دێتە پێشەوە، دەژێت و ئەوەی لە سەرووی هەموو شتێکەوە بۆی گرنگە چێژەجەستەییەکان، یان نائارامی و نائاسوودەگی بەرهەمهاتووی دۆخەکەیەتی. بەتایبەتی بە خۆرەتاوی ئەفریقای باکوور زۆر هەستیارە: هەندێ جار لە تیشکی زێڕین و گەرماکەی چێژ وەردەگرێت، هەندێ جاریش گڕی تیژ و سووتێنەری دەهری و تووڕەی

دەکات. لەهەمبەر کچە هاوڕێکەی، واتە ماریش (Marie)دا، زۆر هەستمەندە. بزە نەخشینەکەی، پێستە سپیکەڵەکەی و لەش و لارە ناسکەکەی، زۆر جێی سەرنجێتی و سوپاس و ستایشیشی لە هەمبەر سیما و ڕواڵەتیدا دێنێتە زمان. بۆ نموونە دەڵێت: "جلێکی کەتانی ئەسپی پۆشیبوو و زوڵفەکانی بڵاوکردبووەوە. پێم گوت کە جوان بووە، لە خۆشیانا پێکەنی". (بێگانە، ٤٧).

بەڵام مۆرسۆ بە وردەکارییە ماددی و لەشییەکانیش گرنگی دەدات، وردەکاریگەلێک کە زۆربەی ئینسانەکان بایەخی نادەنێ، یان لە نیگایاندا زۆر بێ بایەخ و سووک دێنە پێش چاو. بۆ نموونە نیوەڕۆیان، لە فەرمانگە، کاتێ کە بە خاولی دەستەکانی وشک دەکاتەوە و خاولییەکە وشکە و شێدار نییە، زۆر کەیف خۆشە و پێی دەگەشێتەوە، بەڵام دوای نیوەڕۆیان کە خاولییەکە نەختێک شێدارە، تووڕە و قەڵس دەبێت.

مۆرسۆ، لەگەڕەکی کرێکارانی فەڕەنسی لە وڵاتی ئەلجەزایردا دەژی، وەکو گەڕەکی بەلکوور (Belcourt)، واتە گەڕەکی سەردەمی منداڵی کامۆ. هاوڕێ و هاوساکانی مۆرسۆ نە خوێندەوار و نە پارەداریشن. ماری، سکرتێر (منشی)، سێلێست (celeste)، کافەیەکی بچووکی لە گەڕەکدا کردۆتەوە، ئیمانۆئێل (Emmanuel)، فەرمانبەری پۆستخانەیە، سالامانۆ (Salamano)، خانەنشین کراوێکە کە تەنها لەگەڵ سەگەکەیدا دەژی، ڕایمۆند (Raymond)، بۆ خۆی دەڵێت کە بەڕێوەبەری عەمبارێکە، بەڵام خەڵک دەڵێن کە جاکەشە. جێراڵد کامبێر (Gerald kamber)، لە "هێمای ناوەکان لە بێگانەدا" وای دەرخستووە کە ناوەکانی ئەم ڕۆمانە ماناگەلێکی وردتر و ناسکتریان هەیە. بۆنموونە ماری هەر هەمان ناوی مەریەمی عوزرای هەیە، سێلێست، کە ناوەکەی بە مانای "ئاسمانی" دێت، چێشتکەرێکی قەڵەوی ڕاستبینە کە هێمایە بۆ سۆزی مرۆڤانە. ئیمانۆئێل، کە تا ڕادەیەک گەوجە، ناوێکی هەیە کە بۆ باسکردنی مەسیح کەڵکی لێوە دەگیرێت. ناوەکەی لە زمانی عیبریدا واتای "خواوەند لەگەڵماندایە" دەدات. سەرەڕای ئەوەی کە مۆرسۆ و هاوڕێکانی مرۆڤگەلێکی سادە و ساکارن، بەڵام ڕووداوەکانی بەشی یەکەم بەهیچ شێوەیەک سادە و ساکار نین، بەڵکو بەدرێژایی یازدە ڕۆژ مۆرسۆ هەموو ئەم کارانە کە دەیڵێین، دەیکات: لە ڕێوڕەسمی ناشتنی تەرمی دایکیدا بەشدار دەبێت، بەسەرهاتێکی ئەڤیندارانە لەگەڵ ماریدا دەست پێدەکات و قبووڵ دەکات کە لەگەڵی ببێتە هاوسەر. لەگەڵ ڕیمۆن دەبێتە هاوڕێ و بڕیاری دەداتێ کە بۆ تۆڵەسەندنەوە لە خۆشەویستە پێشووەکەی کە هەڵیفریواندبوو،

هاوکاری بکات، برای خۆشەویستەکەی ریمۆن بە گوولەیەک دەکوژێت، ئەمانە بۆ مرۆڤێک کە نوقمی ژیانی رۆژانەیە، رۆژانێکی پڕ رووداون. لەلایەکی ترەوە، شێوازی دەستەویەخەبوونی مۆرسۆ لەگەڵ ئەم رووداوانەدا نیشاندەری جۆرێک لە داهێزراوی و ناکارامەییە. لەهەر بابەتێکەوە رووداوەکان بە هەڵکەوت روودەدەن، نەک بەپێی پلان و گەڵاڵەیەکی پێشووتر و پەرچەکرداری مۆرسۆ لە هەمبەریاندا ئەمەیە رێگایەک هەڵدەبژێرێت کە هەست دەکات ساناترین رێگەیە. دایکی دەمرێت و ئەو بە بێ مەیلییەوە بەشداری لە رێوڕەسمی ئەسپەردەکردنی دەکات، بە هەڵکەوت لەگوێی زەریادا ماری دەبینێت، باسکەمەلەی لەگەڵ دەکات، بۆ سینەما داوەتی دەکات، دەیبات بۆ بیناکەی و شەو پێکەوە رادەبوێرن. حەزی ئێرۆتیکیانەی مۆرسۆ بۆ ماری فشۆک و ناکارا نییە، بەڕای ئەو ماری راکێشەر و ویستراوە، بەڵام کاتێک کە ماری حەوتوویەک دواتر سەری لێدەدات و لەپڕێکدا لێی دەپرسێت، کە ئایا دەیەوێت پێکەوە ژیان پێکبێنن، یان نا، وەڵامی مۆرسۆ بە شێوەیەکی سەرسووڕهێنەر و ناباوەڕانە ناکارامە و فشۆکانەیە.

شەو ماری هاتە لام و پرسی کە ئایا دەخوازم لەگەڵیدا ببم بە هاوسەر. گوتم کە بۆ من تۆفیرێکی نییە و ئەگەر ئەو بیەوێت دەتوانین ببینە هاوسەر. دواتر بەتەما بوو بزانێت کە ئاخۆ من عاشقی هەم یان نا. هەمان وەڵامی پێشووم دایەوە گوتم: ئەمە هیچ پێوەندییەکی نییە بە مەسەلەکەوە، بەڵام وای بۆ دەچم کە عاشقی نەبم. پرسی: "ئیدی بۆ ببین بە هاوسەر؟" بۆم روونکردەوە کە لەڕاستیدا ئەم مەسەلەیە گرینگ نییە و ئەگەر ئەو بیەوێت دەتوانین ببین بە هاوسەر. ئیدی ئەو ئەمەی باسکردبوو و من کارێکم نەکردووە بێجگە لەوەی کە گوتوومە باشە. دواتر بە بیریدا هانیمەوە، کە هاوسەرگیری شتێکی زۆر جیددیە. گوتم: "نەخێر". ئەویش دەم و دەست بێدەنگ بوو بە ماتییەکەوە لێمی روانی. دواتریش هاتە قسە و دەیەویست بزانێت کە ئەگەر ژنێکی دیکەش هەر بەم تایبەتمەندییانەی ئەوەوە ئەم پێشنیارەی دەکرد، ئایا قبوولم دەکرد یان نا. گوتم "بەناچاری".

مۆرسۆ لەگەڵ ریمۆنیشدا بە هەڵکەوت دیدار دەکات. ریمۆن داوەتی دەکات بۆ ژوورەکەی تاکو مۆرسۆ لە دەردەسەری چێشتلێنان رزگاری ببێت. دوای نانی شێوان، ریمۆن داوای لێ دەکات کە نامەیەک بۆ کۆنە خۆشەویستەکەی بنووسێت. ریمۆن خۆشەویستەکەی خستۆتە بەر زەبر و لێدان تاکو خوێناوی بووە، بەڵام هەنووکەش دەیەوێت بەم نامەیە هەڵیخەڵەتێنێت، تاکو جارێکیتر بیگەڕێنێتەوە و بتوانێت بە خەستی ئەدەبی بکات. مۆرسۆ قبووڵ دەکات. "نامەکەم نووسی. بە

شێوازێکی سەرسەری، بەڵام هەموو هەوڵی خۆم دا کە ریمۆن پێی بگەشێتەوە، چوون هیچ هۆیەکی نەبوو کە نەمەوێت ریمۆن بگەشێتەوە و پێی کەیفخۆش بێت. (بێگانە١٤١-٢).

پێکگەیشتنی مۆرسۆ لەگەڵ برای کۆنە خۆشەویستەکەی ریمۆن لە رۆخی زەریادا هەمدیس بە هەڵکەوتە. ئەگەرچی مۆرسۆ دەگەڕێتەوە بۆ ئەو شوێنەی کە دواجار دوو عەرەبی تێدا بینیوە، بەڵام لەوەی کە کەسێک لەوێدا دەبینێتەوە، تێکدەچێت. "تا شوێنێک کە پێوەندی بە منەوە هەبوو بابەتەکە جێگەی باس نەبوو و من بێ ئەوەی تەنانەت بیری لێ بکەمەوە. چووبوومە ئەوێندەرێ" (بێگانە، ٥٨).

بەڵام یەکێک لە عەرەبەکان هێشتا لەوێیە. (جێی خۆیەتی سەرنج بدەین کە قوربانییەکەی مۆرسۆ، واتە برای کۆنە خۆشەویستەکەی ریمۆن، تەنها بە "ئەو عەرەبە" ناوی لێدەبرێت. ئەوەی کە کامۆ ئەم کارەی کردبێت تاکو بێ سۆزی ئەلجەزایرییە فەڕەنسییەکان پیشان بدات، یان بێ سۆزی و بێ هەستی خۆی، لە هەرحاڵدا جیاوازییەکی نییە، ئەنجامی بابەتەکە ئەوەیە کە مرۆڤێک بۆ سەر ئاستی جێناوێک دابەزیوە. کاتێک "عەرەبەکە" دەست دەکات بە گیرفانیدا و چەقۆیەک دەردەهێنێت، مۆرسۆش ئان و سات پەنجەی لەسەر دەمانچەی گیرفانی کۆتەکەیدا دادەنێت. لەم ساتە بەدواوە ئیدی مۆرسۆ بەپێی وتەی خۆی، رۆحی داوەتە دەست تووڕەیی خۆرەتاو. شکستخواردووی گەرما و تیشکی کوێرکەری خۆرەتاو دەبێت، چەند هەنگاوێک دەچێتە پێشێ و لە کابرای عەرەب نێزیک دەکەوێتەوە: عەرەب چەقۆکەی لێ دەڕاسێنێت. تیشکی تیژی خۆرەتاو لە تێغەکەیەوە دەگوازرێتەوە بۆ نێوچەوانی مۆرسۆ. مۆرسۆ، کوێر و شڵەژاو، دەمانچەکەی دەستی دەگوشێت و پەلەپیتکەکەی دەکرچێنێت. گوللە بەر پیاوی عەرەب دەکەوێت. مۆرسۆ هەڵوێستەیەک دەکات و دواتر چوار گوللەی تر بە جەستەی بێ جووڵەی کابرای عەرەبەوە دەنێت. ئەستەمترین کار روونکردنەوەی ئەم کردەوەیەی دواییە-چوار جاری زێدە تەقەکردن لە تەرمەکە. بەپێچەوانەی تەقەی یەکەم کە دەشێت شتێکی بە رووداو بێت: "پەرچەکردارێکی ناهۆشیارانە، یان بەهۆی داخزانی بەهەڵەی دەستییەوە"، ئەو چوار تەقەکەی دیکە دەشێت کردەوەگەلێکی هۆشیارانە بێت. بۆچی مۆرسۆ هەڵوێستەیەکی کرد و دواترکاتێک کە دەیتوانی بڕیار بدات، کە درێژەی پێ نەدات، چوار جاری دیکە تەقەی لە لاشەکە کرد؟ پاڵنەری مۆرسۆ چی بوو؟ مەبەستی چی بوو؟ بەپێچەوانەی گرنگی ئەم پرسیارانە لە کاتی لێپرسینەوە و دادگاییەکەیدا مۆرسۆ

ناتوانێت ڕوونکردنەوەیەکی سەلمێنەرانە بدات بەدەستەوە. ئاشکرایە مۆرسۆ بێ ئەوەی کە بزانێت، یان لەبەرچاو بگرێت، کە کابرای عەرەب زیندووە، یان مردوو، چوار جاری دیکە دەستی تەقەی لێ دەکاتەوە. بە هەموو ئەمانەشەوە هیچ هۆیەکمان نییە کە وا بیربکەینەوە کە ئەو لەژێر کاریگەری هەستێکی خەستی وەکو ڕق، تووڕەیی و یان ترس، ئەم کارەی کردووە. ئەگەرچی تەقەی ئەو لە پیاوە عەرەبەکە بێ سۆزی ئەو لە هەمبەر پیاوێکدا کە هیچ خراپەیەکی دەرهەق نەکردووە، دەنوێنێت. بەڵام وا نایەتە پێش چاو، کە ئەو خولیای کوشتنی ئەو پیاوەی لەسەر بووبێت. لە ڕووبەڕووبوونەوەکانی پێشوویدا لەگەڵ عەرەبەکان لە ڕۆخی زەریادا، مۆرسۆ وادێتە پێش چاوی کە: "مرۆڤ دەتوانێت تەقە بکات، یان نەیکات".

وادیارە ئەو چوار تەقەیەی دوایی بەهۆی خۆبەدەستەوەدانەوەیە، نەک لە سۆنگەی بڕیارەوە. لە بەشی دووەمی بێگانەدا، بەرپرسانی دادگای تاوانەکانی ئەلجەزایر ئەم ڕووداوە بە هەڵکەوت و لەناکاوانە، گرێدەدەنەوە بە پەرچەکرداری سست و داهێزراویانەی مۆرسۆوە و ڕوخسارێکی سامناک و تۆقێنەر لە مۆرسۆ دروست دەکەن. ڕەوتی لێکۆڵینەوە، یان لێپرسینەوەی جیددی ڤەپرس (بازپرس) لە مۆرسۆ دەست پێدەکات. کاتێک کە مۆرسۆ ناتوانێت ڕوونی بکاتەوە کە لەبەر چی دوای تەقەی یەکەم هەڵوێستەی کردووە و دواتر چوار گوللەی دیکەی پەستاوتۆتە نێو لەشی کابرای عەرەبەوە، ڤەپرس خاچێکی زیوین کە وێنەیێکی مەسیحی لەسەر هەڵکۆڵراوە، دەگرێت بەدەستییەوە و لەبەرچاوی مۆرسۆدا دێنێ و دەیبا. لێی دەپرسێت کە ئایا باوەڕی بە خودا هەیە و کاتێک مۆرسۆ لە وەڵامدا دەڵێت: "نەخێر" کابرا ڕق دایدەگرێت. وتی: "مەحاڵە، هەموو مرۆڤەکان باوەڕیان بە خودا هەیە، تەنانەت ئەوانەش وا لێی ڕوو هەڵدەگەڕێنن. ئەمە بیروباوەڕی ئەو بوو و ئەگەر گومانی تێدا بکردایە، ژیانی بۆش و بێ مانا دەبوو. بە توندی هاواری کرد: تۆ دەتەوێت ژیانی من بێمانا بکەی؟". (بێگانە، ٦٩)

لە کۆتایی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا ڤەپرس ئیدی مۆرسۆ بە "جەنابی دەجال" بانگ دەکات. هۆی دابڕاندن و بەخشینی ئەم ناتۆرەیە بەسەر مۆرسۆ ئەوەبوو، کە تەواوی ئاکار، کردە ئاڵۆز و بێ ماناکانی مۆرسۆ بۆ گاورە بەڕێزەکان مانادار بکرێتەوە. ئەگەر کەسێک وا بیر بکاتەوە کە مۆرسۆ وێناکراو و هێمای شەڕە، ئەوکات هەموو کردەوەکانی ئەو لە بەشی یەکەمدا هەر بەم پێوانە و سەنگەوە ڕوون دەکاتەوە.

ڕەوتێک کە بە لێپرسینەوەی ڤەپرس دەستی پێکردووە، دادوەر لە دادگادا درێژەی پێ دەدات. دادوەر بە وردییەکەوە هەڵسوکەوت و ئاکاری مۆرسۆ لەمەڕ ناشتنی دایکییەوە دەخاتە بەر شیکاری و هەڵسەنگاندن و لە خاڵێکدا بەوە تاوانباری دەکات کە: "مۆرسۆ دایکی بە شێوەیەکی کارەساتاوی لە دڵدا بە خاک سپاردووە". (بێگانە، ١٠١-٢).

دادوەر سەربووردەی عاشقانەی مۆرسۆ لەگەڵ ماری و نامەنووسینی بۆ ریمۆن گرێدەدات بە ئەنگێزەی ئەو بۆ کوشتنی پیاوە عەرەبەکەوە:

"هەر ئەم مرۆڤەی کە لە بوولێڵی مەرگی دایکییەوە دەست دەداتە پیسترین و ناشیرینترین ئاکاری ئێرۆتیکییانە، بە هۆکارگەلی زۆر سووک و ئاسانەوە مرۆڤ دەکوژێت، ئەوەش بۆ پێکەوەنانی پیسی و گەندەڵییەکەوە کە شیاوی باسکردن نییە". (بێگانە، ١٠١-١٠٢).

دادوەر لە کۆبەندی قسەکانی خۆی، لە کۆتایی دادگاییکردنەکەدا بەم خاڵەشەوە ناوەستێتەوە. دادوەر کە لە قسەزانی و دەمکراوەیی خۆی خرۆشا بوو. تێدەکۆشێت گوناهی مۆرسۆ هەڵپێکێت بە دانیشتنێکی دیکەی دادگاوە، واتە دادگاییکردنی پیاوێک کە تۆمەتبارە بە کوشتنی باوکی:

پیاوێک کە لە ڕووی ئەخلاقییەوە تاوانی کوشتنی دایکی لە ئەستۆیە و خۆی لە کۆمەڵگا دادەبڕێت، دەقاودەق هەر ئەو تاوانبارەیە کە دەستی تاوان لە باوکی دەکاتەوە، کە بوونی داوەتێ. بەهەرحاڵ، کردەوەی تاوانباری یەکەم ڕێگەخۆشکەری کردەوەی تاوانباری دووەم بووە، لەڕاستیدا یەکەمینیان سەرمەشقی (سەرچەشن) دووەمینیانە و پسووڵەی کردنی تاوانی بۆ دەرکردووە. دواتر دەنگی تۆزێ هەڵبڕی و وتی: "برایان، من دڵنیام لە سۆنگەی ئێوەوە زێدەڕۆیی نییە ئەگەر بڵێم کە ئەو پیاوەی وا ئێستە لە جێگەی تاوانبار دانیشتووە، گوناهی کوشتنێکیش کە سبەینێ دانیشتنی لەسەر دەکرێت، لە ئەستۆیە". (بێگانە، ١٠٢).

دادوەر دەڵێت: ئەمە ((ئەرکی ئەستەمی)) ئەوە، کە خوازیاری سزای ئیعدام بێت، بەڵام بەم حاڵەشەوە دەڵێت: "بە دڵێکی ئارامەوە ئەم داوایە دەکەم، چونکە... لە درێژایی ژیانمدا هیچ کات ئەوەندەی ئێستا ئیمانم لەسەر ئەم حوکمە پیرۆزە قورستر نەبووە، هیچ کاتیش بەقەد ئێستا ئەوەندە هەستی سامناکیم نەبووە لە کاتی بینینی روخساری ئەم پیاوەدا، کە جگە لە ئاژەڵێکی دڕندە، هیچی تێدا بەدی ناکەم، هەر ئەمەش وادەکات کە دەرکردنی ئەم حوکمە بۆ من زۆر سووک و

ئاسان و روونتر بێتەوە". (بێگانە ۱۰۲، TRN، ۱۱۹۸).

دەستەی دادوەران پێمل دەبێت و مۆرسۆ سزا دەدرێ، کە لە مەیدانی گشتیدا بدرێتە دەست تێخی گیوتین. لە دانیشتنی دادگاییکردنی مۆرسۆدا چیمان بۆ دەردەکەوێت؟ کامۆی لاو، کاتێک هەواڵنێری رۆژنامەی ئالجێر رێپۆبلیکەن بوو، زۆربەی کات راپۆرتگەلێکی لەبارەی سزادانە تاوانکارییەکان لە ئەلجەزایر کۆدەکردەوە و زانیاریگەلێکی سەرەکی لەبارەی لاوازی و ناتەواوییەکانی دادوەریکردن هەبوو. ئەو تەنانەت لە برگەیەکی دیاردا خۆی دێنێتە ناوی رۆمانەکەوە. لە سەرەتای دادگاییکردنەکەدا، گەنجترین هەواڵنێری ناو رێڕەوەکە سەرنجی مۆرسۆ رادەکێشێت، پیاوێک بە پانتۆڵێکی خۆڵەمێشی و بۆینباخێکی شینەوە، چاوی بڕیوەتە چاوەکانی. "ئەو شتەی کە لە رووخساری تا رادەیەک داکەوتوویدا بەدیم کرد دوو چاوی زۆر گەشاوە بوون، واقم مابوون و ئەم هەستە نامۆیە داگیریکردم کە دەڵێی خۆم چاوم بڕیوەتە ناو چاوەکانی خۆم". (بێگانە، ۸۵).

بێگومان، یەکێک لە ئامانجەکانی کامۆ لە دانیشتنی دادگاییکردنی مۆرسۆدا بەدەستەوەدانی لێکدانەوەیەکە سەبارەت بە رەوتی دادوەری تاوانکاریی. ئەو بە ئەزموون دەیزانی کە چۆنچۆنی پارێزەران، بەڵگەکان دەئاڵۆزکێنن و لێکی گرێدەدەن، تاکو رەوتی دادگاییکردن ببەنە پێشەوە. ئەو دەیزانی ئەوان خودا، دایک و وڵات دەکەن بە بڕوبیانوو بۆ ئامانجەکانیان. ئەو دەیزانی کە دادوەران و دەستەی دادوەران دەتوانن چەندە کوشندە و بەڕواڵەت حەقخواز دەربکەون. لەگەڵ ئەمانەشدا، ئەم دادگاییکردنە لایەنێکی فەلسەفیشی هەیە، راستە ئەو تاوانە سەیر و سەمەرانەی کە دادوەری گشتی و لیژنەی دادوەری دەیدایە پاڵی مۆرسۆ، جۆرێک قەشمەری بە دادوەریکردنی سزاکانە، بەڵام بێ نرخیش نین. مۆرسۆ هەڕەشەیەکی راستەقینەیە. راستە کە ئەو نە پیاوکوژێکی دڵڕەقە و نە دەجالیش، بەڵام وێنا و ئیماژی قارەمانێکی پووچە. شتێک کە لەم بوونەوەرەدا نامرۆیی (دۆڵپاڵاسا) و دەرەمرۆیی دەنوێنێت، هەڵکەوتوویی ئەو بۆ ئەنجامدانی تاوان و دەستدانە کارگەلی پیس نییە، بە پێچەوانەوە، دەربەست نەبوونی ئەو بۆ ئومێدەکان، ئیمان و هەروەها ئەو ئارمانجانەیە وا زۆربەی خەڵک لەگەڵیدا دەژین. مۆرسۆ بە بێدەربەستبوون بە خوا، داهاتوو و یان بە تێڕوانینی ئینسانە بەڕێزەکان سەبارەت بە خۆی، مرۆڤێکی مەترسیداری لێدەرچووە، واتە یاخییەک. بێگومان مۆرسۆ یاسای بنەمایی دژە مرۆڤکوژی خستۆتە ژێر

پێوە، بەڵام ئەم یاساشکێنییە، بەنیسبەتی بێدەربەستی ئاشکرای ئەو بۆ دین و پێکهاتەی ئەخلاقی جیهانییەوە، لاکەوتە و پەراوێزە. هاوبەش نەبوونی مۆرسۆ لە باوەڕەکانی خەڵکدا خراپە، بەڵام خراپتر ئەمەیە کە تەنانەت وەهاش نانوێنێت کە لە باوەڕەکانیاندا هاوبەشە. ڤەپرس کاتێک مۆرسۆ نکوولّی باوەڕی خۆی بەخودا دەکات، دەقیژێنێت: "ئایا دەتەوێت ژیانی من بێمانا بکەیت؟". (بێگانە، ٦٩).

لەڕاستیدا بەم رستەیە ئاماژە بەم مەترسییە دەکات. راستە کە رەنگە ئەوانەی وا دادوەری لەسەر مۆرسۆ دەکەن، بە دروستی نەزانن مەترسییەک کە مۆرسۆ بۆ کۆمەڵگا هەیەتی، فەلسەفییە و نەک جینایی، بەڵام بە هەرحاڵ مەترسییەکەی هەست پێدەکەن. درووستە کە مۆرسۆ بێ هیچ بزوێنەرێکی لۆژیکی مرۆڤێکی کوشتووە، تەنانەت بێ ئەوەی سووسەیەکیش چییە هەست بە پەشیمانی بکات، کە ئەو مافی ژیانی لە کەسێک وەرگرتووە، بەڵام دەکرێت دادوەرییەکی جیاواز وێنا بکەین کە تێیدا مۆرسۆ سزای دەستبەسەرداگرتن لە نەخۆشخانەیەکی دەروونی بەسەریدا بسەپێت، چونکە توانای جیاکردنەوەی راست و هەڵەی نییە و ئاکاری پێشبینی ناکرێت، بەڵام سزایەک کە دراوە لەو جۆرە سزادانانە نییە. گریمانەی نەدرکاوی حوکمە راستەقینەکە! ئەمەیە: رەگەزپەرەستی لە ئەلجەزایری ژێر پۆستاڵی فەڕەنسادا، چونکە مۆرسۆ سپی پێستێکی ئەورووپاییە و کوژراو عەرەبێک، ئەم گریمانەیە هەیە کە مۆرسۆ بەر جۆرێک لە بەزەیی دەکەوێت. رەنگە ئەمە بتوانێت بە جۆرێک روونیکاتەوە، کە بۆچی پارێزەری مۆرسۆ لە سەرەتاوە ئەوەندە دڵنیایە کە ئیشەکان بە باشی دەڕۆنە پێشەوە، بەڵام مۆرسۆ بە سەرپێچی لە جەختکردن لە باوەڕە مەسیحییەکان، سەرپێچی لە خەمگین نواندنی خۆ لە مەرگی دایک، یان دەربڕینی پەشیمانی لە کوشتنی ئەو پیاوە عەرەبە، خۆی لەم بەزەییە بێبەش دەکات. ئەو پیشانی دەدات کە "بێگانە"یە. وشەی (unetranger)، کە لە زمانی فەڕەنسیدا سەرەڕای مانای بیانی و غەریبە بە مانای مرۆڤێکیشە کە نایناسن. بەم پێیە ئەو لە چینی دەسەڵاتدار کە دەیتوانی یارمەتی بدات، دابڕاوە. بۆیە سزادانی ئیعدام بە گیۆتین، بە پێداگری دادوەری لەسەر "گوناهکاری ئەخلاقیی" ئەو لە کوشتنی دایکی و باوکی ئەو پیاوە (رەنگ) سپی پێستەی، تاوانبار بە کوشتنی باوکی، جۆرێک لە شەرعییەتی رەگەزی دەگرێتە خۆ. مۆرسۆ دوای سزادان، رەوانەی زیندانێکی تاکەکەسی دیکە دەکەن، زیندانێک لە بەشی سزادراوان بە مەرگ، تاکو چاوەڕوانی جێبەجێبوونی سزای ئیعدام بێت. ئەو داوای پێداچوونەوە و لێبووردنی کردووە، بەڵام هیچ وێنایەکی نییە کە ئایا

داواکەی قبوول دەکرێت، یان نا. شەو و ڕۆژی بە خەونی ڕێگەهەڵاتنێک لە ئیعدام ڕادەبوورێت و چاوەڕوانە بزانێت بەرلێبووردن دەکەوێت، یان ئیعدامی دەکەن.

ئەگەرچی مۆرسۆ بارەها خۆی لە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ قەشەی تایبەت بە زیندانیان دەپاراست، بەڵام بەهەرحاڵ قەشە دێتە ژوورەکەیەوە. مۆرسۆ سەرەتا لەرز دایدەگرێت، چوون وا دەزانێت ساتی ئیعدامەکەی گەیشتووە. قەشە دڵنیای دەکاتەوە کە ئاوەها نییە و دڵنیایی خۆی بۆ قبووڵبوونی داوای لێبووردنەکەی دەردەبڕێت. دەڵێت ئامانجی لەم هاتنەی بۆ ژوورەکەی مۆرسۆ، هەڵگەڕاندنەوەی سەرەنجی مۆرسۆ لە دادی (عەدالەت) ئینسانی بۆ دادی ئیلاهی و لە گوناهی یاسایی بەرەو گوناهی کەبیرەیە. مۆرسۆ وەڵام دەداتەوە باوەڕی بەخودا نییە و ناشخوازێت ئەم دەرفەتە کورتەی کە بۆی ماوەتەوە بە خەون و ختوورەی ژیانی دوای مەرگ بەفیڕۆ بدات. کاتێک کە قەشە مۆرسۆ دڵنیا دەکاتەوە کە سەرەڕای دڵی تاریکی، ئەو دوعای بۆ دەکات، مۆرسۆ خۆی بۆ ناگیرێت. مۆرسۆ لەباتی ئەوەی وەکو هەمیشە و بەپێی خووی رابردووی بە وانواندنێک بۆ هاوکۆک بوون لەگەڵی، یان گوێ نەدان بە قەشە لە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵیدا پارێز بکات، چنگ لە جامانەکەی وەردەنێت و بە هەرا و هۆریاوە بەر جنێوی دەدات. بە قەشە دەڵێت: "هیچ کام لە دڵنیاکارییەکانی بایەخی تاڵە قژی ژنێکیان نییە" و تەنانەت نازانێت کە زیندووە، "چونکە وەکو مردووان دەژی".

پاسەوانەکان دێنە ژوورەکەیەوە و قەشە لە چنگی مۆرسۆ رزگار دەکەن. مۆرسۆ، شەکەت و وڵەکەت لەم پێداهەڵشاخانە، لەسەر سیسەمەکەی خەوی لێدەکەوێت. کاتێک لە خەوا دێت "ئەستێرەکان لەسەر روخساری دەزریوێنن". (بێگانە، ١٢٢).

شنەیەک لە ژوورەکەیدا هەڵدەکات کە بۆنی شەو، خاک و هەوای خوێناوی (نمکی) هەیە. مۆرسۆ جارێکی دی لە پێوەندی لەگەڵ جیهانی ماتریاڵیدا، گیانی وەبەردەکەوێتەوە. وتەکانی کە زۆربەی کات وشک و بێ ڕۆح بوون، شێواز و قەوارەیەکی تەغەزوولی دەگرنە خۆیان: "ئەوکات لەو تاریکییەی پێش بوولێڵدا زەنگەکان هاتنە دەنگ، زەنگگەلێک کە جاڕی کۆچیان بەرەو جیهانێک لێدەدا کە هەنووکە و بۆ هەمیشە هیچ مانایەکی بۆ من نەبوو". (بێگانە، ١٢٢).

بۆ یەکەمین جار بە درێژایی چەند حەوتەیەک بیر لە "دایە" دەکاتەوە، دەکەوێتەوە یادی پێوەندی ئەڤیندارانەی دایە لەگەڵ تۆما پرێز (The Allegory of the names in 'l'Etranger')ی پیر، "دەزگیرانی ئەو لە خانەی بەساڵاچوواندا".

مۆرسۆ تێدەگات کە ئەویش ئامادەیە تاکو ژیان سەرلەنوێ بژێت. "دەتگووت ئەم رقە پڕخرۆشە منی لە هەرجۆرە خراپی و گەردێک پاککردبووەوە، لە هیوا بەتاڵ و قوتاری کردبوومەوە، بۆ یەکەمین جار، لەو شەوی گەش و رۆشنە بە نیشانەکان و ئەستێرەکان، دڵم بە رووی بێڕەحمی و بێدەربەستی پڕسۆزی جیهاندا کردەوە. دیتم کە جیهان بە شێوە چەندە لە خۆم دەچێت –وەکو برام وایە– و هەستم کرد بەختەوەر بووم و جارێکی دیش هەر بەختەوەرم".

مۆرسۆ، تامەزرۆی ژیان، بەڵام ئاشتی کەر لەگەڵ مەرگ، هیوادارە کە لە رۆژی ئیعدامی دابینەرانێکی زۆر هەبن و بە "زایەڵەگەلی نەفرەت" پێشوازی لێ بکەن. (بێگانە، ١٢٣).

### ب.رەخنەی فەلسەفیی "بێگانە"

لە رووی فەلسەفییەوە گرنگترین بەشی بێگانە، بەشی کۆتاییە. لەم بەشەدایە کە مۆرسۆ بۆ هەوەڵجار وشەگەلێک بۆ دەربڕینی باوەڕی خۆی، سەبارەت بە پووچی حاشا لێ نەکراوی ژیانی ئینسانی دەدۆزێتەوە. جێی سەرنجە کە ئەم وشانە بەهۆی هەوڵ و تەقەللاکانی قەشەی زیندانە کە لە زەینی مۆرسۆدا سەردەردێنێت. قەشە، بەبیرمانی دێنێتەوە کە هەمووومان لەبەر سزای مەرگداین، تەواوی ئێمە، دێر یان زوو، دەبێت لەگەڵ داوەریی خوداوەند و چارەنووسی ئەبەدی خۆمان رووبەڕوو بکرێین. مۆرسۆ بە قەشە دەڵێت: باوەڕی بەخودا، یان ژیانی دوای مەرگ نییە و نایەوێت ئەو چۆرەژیانەی کە بۆی ماوەتەوە، بە بیرکردنەوە لەسەر بابەتگەلێک کە بێگومان بۆی سەرنجراکێش نین، خەسار بکات. کاتێک قەشە تکا دەکات کە مۆرسۆ بڵێت: ئەو ژیانەی کە دوای مەرگ دەتوانێت خەونی پێوە ببینێت کامەیە، مۆرسۆ هاوار دەکات: "ئەو ژیانەی کە تێیدا بتوانم ئەم ژیانەم بەیاد بهێنمەوە!" (بێگانە، ١٢٠).

خۆشەویستی مۆرسۆ بۆ ئەم ژیانە زەمینییە، تەنانەت لەبەردەم مەرگیشدا، بۆ قەشە زۆر شڵەژێنەرانەیە. ئەو، کە قەشەیەکی کاتولیکی نەریتی (سوننەتیی) رۆمییە، ژیانی زەمینی وەکو دەربەندێک لە ئەسرین، کەوا داکەوتووی جیهانە، دەزانێت، کە تێیدا بەختەوەری راستەقینە و هەتاهەتایی دەست ناکەوێت. ئەو، مۆرسۆ دەخاتە ژێر زەخت و گوشارەوە و مۆرسۆ دەتەقێتەوە. وشەگەلێک کە کامۆ بۆ باسکردنی ئەم تەقینەوەیەی مۆرسۆ هەڵیبژاردووە دەرخەری ئەوەن، کە: "ئەوەی وا لەبنی دڵمدا بوو، بە توورەیی و شادی بەسەریدا باراندم".

مۆرسۆ لێرەدا تەنها قەشە ناداتە بەرجنێوی خۆی، بەڵکو بۆ یەکەمجار ئەوەی وا بەڕاستی لە دڵیایەتی دەیخاتە دەرەوە. بە مانایەک، ئەم بەرەوڕووبوونەوەیە، دانپێدانانیشە. ئەو بە دەربڕینی قووڵترین بڕواکانی خۆی بۆ پووچی زاتیی و بڕاوەی ژیان، حاشاکەری پێویستی بە بەخشیشی خودایە و لە هەر جۆرە گومانێک لەبارەی مانای کۆتایی و غایی لەبارەی ئەو هەڵبژاردنانەی کە کردوویەتی، پارێز و دووری دەکات. پووچی زاتیی ژیان چییە؟ مۆرسۆ لە بڕگەی ژێرەوە هەوڵ دەدات روونیکاتەوە:

من بەم شێوەیە ژیابووم و دەمتوانی بەشێوەیێکی دیکەش بژیایەم. من فڵان ئیشم کردبوو و دەمتوانی فیسار کاریش جێبەجێکەم... هیچ شتێک، هیچ شتێک بایەخێکی نەبوو و من دەمزانی بۆچی. ئەویش دەیزانی. لە سەرتاسەری ئەو ژیانە پووچەی کە ژیابووم، هەناسەیەکی رەش و تار لە قووڵاییەکانی داهاتوومدا، لە سەرووی ئەو ساڵانەی کە هێشتا نەهاتبوون، بەرەو پێخم دەشنایەوە... مەرگی دیتران، سۆزی دایک، ئەمانە چ بایەخێکیان دەتوانی بۆ من هەبێت؟ خودای ئەو، یان ئەو ژیانانەی کە خەڵک هەڵیاندەبژارد، چارەنووسگەلێک کە دەیانقۆزتەوە، چ بایەخێکیان دەتوانی بۆ من هەبێت، منێک کە بەهەرحاڵ بەتەنها، تاقانە چارەنووسێکی یەکە دەیتوانی هەڵمبژێرێت و هاوڕێ لەگەڵ مندا ملیۆنەها ئینسانی خۆشەویستی تر کە وەکو ئەم قەشەیە، خۆیان بە برای من ناوزەد دەکات؟... دیتران هەموو رۆژێک دەدرێنە بەر ئەم سزایە، ئەویش سزا دەدرێت.

مانای ئەم بەشە بۆ رەخنەی فەلسەفی بێگانە زۆر گرینگە، چەنکە تەنها لەم بەشەی رۆمانەکەدایە کە مۆرسۆ، واتە وەگێڕ "راوی" و کەسایەتی سەرەکی رۆمان، تێدەکۆشێت روونکردنەوەیەکی فەلسەفی بۆ باوەڕەکانی خۆی سەبارەت بە دۆخی ئینسانی دەربخات، بەڵام لە هەمان کاتدا روونکردنەوەی پێشکەشکراو لەم بەشەدا لە چەند رووەوە ناتەواو و دەڵەمە دەنوێنێت. وەرن چاو بگێڕین کە جێگای چی لەم بیچمبەندییەدا خاڵییە و هەوڵبدەین بڵێین چۆنچۆنی ئەم بیچم دانانە دەشێت، یان دەبێت تەواو و کامڵ بێت. بنەماییترین وتەی مۆرسۆ ئەمەیە، کە ئەم ژیانە خەڵک دەیبەنە سەر و ئەو هەڵبژاردنگەلێشە کە دەیکەن "بێ بایەخە"، چوون هەمووان دێر یان زوو دەمرن. ئەوەی وا لەم بڕگەیەدا باس نەکراوە، ئەمەیە کە مەرگ، کۆتایی ژیانی ئینسانە لە پێگەی تاکێک، یان بوونەوەرێکی ئاگادا. ئەگەر ژیانێکی دوای مەرگ هەبێت، بۆ نموونە بەهەشتێک یان جەهەننەمێک، ئەوکات هەر ئیشێک کە تاک لە درێژایی ژیانیدا دەستی داوەتێ، دەتوانێت بە راستی بۆ

ژیانی دواتری "بایەخی" هەبێت، بەڵام مۆرسۆ پێشتر حاشای هەرجۆرە باوەڕ بە خودا، یان ژیانی دوای مەرگ دەکات و ئەم حاشاکردنە گریمانەیەکی بە زار نەهاتووە لە روونکردنەوەکەیدا. رەتکردنەوەی خودا هەروەها خوێندنەوەیەکی رەواقییانە لەم باسەدا پووچەڵ دەکاتەوە. رەواقییە رۆمی و یۆنانییەکان دەنگبێژ و راگەیەنەری "بێ دەربەستی" بەنیسبەت چەرمەسەری و بەختەوەرییەکانی ژیان بوون، بەڵام ئەم ئامۆژگارییەیان لەسەر بنەمای ئەم باوەڕە بوو کە هەموو رووداوەکان بەپێی خواستی عەقڵی ئیلاهی روو دەدەن.

دەشێت گریمانەیەکی نەوتراوی تر لە دووتوێی باوەڕی بێخەوشی مۆرسۆ بە خودی ژیان بدۆزینەوە. لە هیچ جێگایەکی رۆمانەکەدا شتێک نابینینەوە، کە پیشان بدات مۆرسۆ لە ژیان وەڕەس و شەکەت بووە، یان بیر لە خۆکوژی دەکاتەوە. بە پێچەوانەوە، ئەو ئینسانێکە کە هەر رۆژی ژیانی و ساکارترین چێژگەلێک کە پانتای ماددی دەوروبەری خۆی پێشکەشی دەکات، بە چێژەوە هەڵیدەلووشێنێتە گیانییەوە. تەنانەت ژیانی لە زینداندا دوای ماوەیەک ساکار و سانا دەبێتەوە و بیر دەکاتەوە کە دەتوانێت لە بۆشایی کلۆری دارێکیشدا ژیان بکات. راستەوڕاست لە کۆتایی رۆمانەکەدایە، کە دەڵێت ژیانێکی خۆشی رابواردووە و هێشتاش خۆش و بەختەوەرە. بۆیە، ئاشکرایە کە خودی ژیان بۆ مۆرسۆ "بێ بایەخ" نییە. لەڕاستیدا، دەتوانین بڵێین کە ئەو بیر دەکاتەوە ژیان بایەخێکی زاتی و جەوهەری بۆ هەموو ئینسانەکان هەیە.

ئەوە چییە کە بایەخی نییە؟ "نموونەگەلێک" کە مورسۆ دەیهێنێتەوە، ئەم وەڵامە دەدەن بە دەستەوە، کە ئەوەی وا بایەخی نییە هەڵبژاردنەکان، کردار و ئەو رووداوە تایبەتانەیە کە ژیانی ئینسانە جۆراوجۆرەکان پێکدێنێت.

چ بایەخێکی هەبوو ئەگەر ئەو تۆمەتباری قەتڵ ببوایە و لەبەرئەوەی لە رێوڕەسمی ناشتنی دایکیدا بەشداری نەکردبوو، لە دار بدرایا؟ سەگی سالامانۆش بە هەمان ئەندازەی ژنەکەی بایەخی هەبوو... چ بایەخێکی هەبوو کە ریمۆن بەهەمان ئەندازە هاوڕێ و یاری ئەشکەوتم بوایە، یان سیلێست، کە زۆر لەو بەبایەخترە؟ چ بایەخێکی هەبوو کە ئەمڕۆ ماری ماچێکی دەبەخشییە مۆرسۆیەکی تازەتر؟ (بێگانە، ٤٠).

بەسەرنجدان بەم نموونانە، دەشێت بگوترێت کەئەم جەختکردنەی مۆرسۆ کە "هیچ شتێک بایەخی نییە"، لەخۆگری ئەم مانایەشە کە "خودی ژیان بایەخی هەیە، هەرچەندە شێوازی ژیان و هەڵبژاردنە تاکییەکان بایەخێکیان نییە". ئەم

وتەیە لەگەڵ وتەیەکدا کە مۆرسۆ لە بەشی یەکەمدا بە سەرۆکەکەی دەڵێت، یەکدەگرێتەوە: "هەر ژیانێک بەهەمان ئەندازەی ژیانێکی دیکە باشە". (بێگانە، ٤٠).

بەهەموو ئەمانەشەوە، ئەمە هەموو بەسەرهاتەکە نییە. ئەوەی هێشتا دەبێت تێبیگەین چەشنی "بایەخێکە" کە مۆرسۆ لێرەدا باسی دەکات. وشەی "بایەخ" بەگشتی وشەیەکی پێوەندییە، واتە (نواندنی پێوەندارێتییە).

(ئەمەی کە بڵێین  بایەخی هەیە) بەم مانایەیە کە  بایەخی بۆ  هەیە، سەرەڕای ئەمەش  دەتوانێت بایەخی بۆ  هەبێت، چونکە ئامێرێکە بۆ گەییشتن بە ئامانج، یان خۆی لە خۆیدا ئامانجە، یان هەردوو حاڵەت. کامۆ لە سەرتاسەری زۆربەی ژیانیدا عەودالی چارەسەر و سارێژێک بوو بۆ نەخۆشی سیلەکەی. دەرمانکردنی سیل بۆ کامۆ بایەخی هەبوو، چونکە ئامێرێک بوو بۆ گەییشتن بە ئامانجی ژیانێکی دووردرێژتر و تەندروستتر.

لەبەرئەوە، دەبێت لەم بانگەشەیەی مۆرسۆ کە ژیان و هەڵبژاردنە تایبەتییەکانی ئێمە، هیچ بایەخێکیان نییە، چونکە دێر یان زوو ئێمە هەموومان دەمرین، چ تێگەیشتنێکمان هەبێت؟ ئەگەر مەبەستی ئەو لە "بایەخ" هەمان "بایەخ بۆ ژیانی دوای مەرگ" بێت، بەسەرنجدان بەم گریمانەیەی ئەو، کە ژیانی دوای مەرگ بوونی نییە، بانگەشەکەی ئەو وەکوو لۆژیک ڕاست و درووستە، بەڵام هەمانگۆیانە و ئەم ئەوییە "واتە بە پێی گریمانە یان پێناسەیەک درووستە". لەلایەکی ترەوە، هەڵبژاردنی تاک و دەرئەنجامەکانی ئەم هەڵبژاردنانە زۆرتر بۆ خودی ئەو تاکە بایەخیان هەیە، چونکە بۆ ئەوە کە ڕۆڵی ئامێر، یان ئامانج دەگێڕن. سەرەڕای ئەمەش، هەندێک لەم هەڵبژاردنانە دەتوانن بۆ دیتران، دوای مەرگی ئەو تاکە، بایەخیان هەبێت. تەنانەت خودی مۆرسۆش بە هیچ کڵۆجێک لە ئاستی بزوێنەر و ختووکەدەرەکانی ماددی دەورووبەریدا کەمتەر خەم نییە. بە پێی پێلێنانی خۆی، ئەو، پیاوە عەرەبەکە لەبەر ئەمە دەکوژێت چونکە گەرمای خنکێنەری هەتاو لەسەر وجوودی زاڵ بووە. دوای ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ قەشە، ئەوەی وا ڕۆحێک دەکات بە بەرییەوە "بۆنی شەو، خۆڵ و شنەی خوێ ئامێز"ە، کە "کەللەسەری فێنک دەکاتەوە". (بێگانە، ١٢٢).

کاتێک لە خاولییە خووساوەکەی ئاودەست بەدەنگ هات و هاواری بردەلای سەرۆک، سەرۆک شانێک هەڵدەکێنێت، یانی کە "بابەتێکی سووک و بێ بایەخە".

بەڵام بۆ مۆرسۆ ڕاشکاوانە بایەخی هەیە. سەرەڕای ئەمەش، بایەخ بە ڕوانینی دیتران بۆخۆی دەدات. کاتێک کە سێلێست، دوای هەوڵە جیددی، بەڵام

بێ ئاكامەكەی بۆ شایەتیدان لە دادگا، لێبووردووانە بە "لێوگەلێکی لەرزۆکەوە" تێی دەڕوانێت، مۆرسۆ دەڵێت: "یەکەم جارە لە ژیانمدا دڵم دەیخوازی پیاوێک ماچ بکەم". (بێگانە، ۹۳).

ئێمە ناتوانین تێبگەین کە ژیان و هەڵبژاردنەکانی مۆرسۆ لە زیندەگیدا، دوای مەرگی ئەو چ بایەخێکیان بۆ دیتران هەیە، بەڵام ئاسان دەتوانین وێنای بکەین کە ئەم ژیان و هەڵبژاردنانە بۆ ماری یا ریمۆن، یان تەنانەت بۆ قەشەش دوابەدوای رووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ مۆرسۆدا "کە چاوەکانی ئەسرینڕێژ ببوون"، بایەخی دەبێت. (بێگانە، ۱۲۲).

ئەگەر، ئەم روانینە کە "شێوازی ژیانی ئینسان و هەڵبژاردنەکانی بایەخی نییە، چونکە مەرگ هاتنێکی لێبڕاوانەوە و بێ پێچ و پەنایە" هامانگۆیانە، یان درۆئامێز نەبێت، دەبێت "بایەخ" لێرەدا مانایەکی بەرینتر لە "بایەخ بۆ ژیانی دوای مەرگ"ی هەبێت و مانایەکی وردتریشی لە "بایەخ بە هەموو چەشنییەوە"ی هەبێت، بەڵام ئایا دەکرێت ئاوەها بێت؟ یەکێک لەو نموونە باشانە بۆ ئاوەها خوێندنەوەیەک، "بایەخێک لە سەرووی خەون و بەرژەوەندی تاکەکانی ئینسانەوە"یە. ئەوەی وا لەم خوێندنەوەیەی "بایەخ"دا لە دەرەوەی بازنەدا دەمێنێتەوە، هەر جۆرە پێکهاتێکی ئەخلاقی، یان زنجیرەیەک لە پلە و ریزبەندی بەهاکانە، کە بە شتێک جگە لە خەون و بەرژەوەندییەکان "پێداویستییەکان، خەونەکان، سەرێتییەکان و خولیاکان و... هتد"ی تاکەکانەوە گرێدرابێت. بەم خوێندنەوەیە، هەڵبژاردن و کردارە ئینسانییەکان لەلایەن خوداکان، چارەنووسەکان، بەها ئەزەلییەکان، مافەسرووشتییەکان، یان یاساکانی مێژوو نییە کە بایەخ بەخۆوە دەگرن. بۆیە، دەکرێت لە تێڕوانینی مۆرسۆوە ئاوەها دەرئەنجامێک وەربگرین: "بەهۆی لێبڕاوەیی مەرگەوە، شێواز و چۆنێتی ژیانی ئینسان و هەڵبژاردنەکانی بایەخێکیان لە سەرووی بەرژەوەندی و خەونەکانی مرۆڤەوە نییە".

شتێک کە دەمێنێتەوە و دەبێت روونیکەینەوە و لەسەری بڕۆین ئەمەیە، کە ئایا لە روانینی مۆرسۆدا بایەخی خودی ژیانیش لەهەمان چەشنی بایەخگەلێکە کە هەڵبژاردنەکان و کردارە تایبەتییەکان هەیانە، یان وابیردەکاتەوە کە بایەخی خودی ژیان چەشنێک بایەخی نێوناخی و زاتی یان گشتی و سەرتاسەرییە؟ رەنگە بە هەمان شێوە کە مۆرسۆ بە سەرۆکەکەی دەڵێت: هەر ژیانێک بە هەمان ئەندازە و بارستایی ژیانێکی دیکە بایەخی هەیە، بەڵام ئاخۆ خودی ژیان بۆ باشە؟ مۆرسۆ راشکاوانە بایەخ دەداتە ژیانی خۆی و لە زیندووبوون

چێژ وەردەگرێت، بەڵام ئاخۆ بایەخ، تەنها رووخسار و دەرکەوتەیەکی دیکەی خواست و خەونێکی تاکییانەیە، یان شتێکی گشتی و سەرتاسەریتر رەنگڕێژی دەکات و دەردەخات؟ ئایا ژیان بۆ هەموو ئینسانەکان ئامانجێکە لەخۆیدا؟ ئەگەر ئاوەهایە، بۆچی هەزارەها هەزار ئینسان ساڵانە خۆیان دەکوژن؟ ئایا باوەڕ بەمەی کە هەر ئینسانێک دەبێت بۆ خودی ژیان بایەخ دابنێت، بنەمایەکی هەیە؟ دەقی بێگانە ئەم پرسیارانە لە زەیندا دەورووژێنێت، بەڵام وەڵامێکیان بۆ رێکناخات. بۆ فامکردنی ئەندێشەکانی کامۆ سەبارەت بە بایەخی خودی ژیان دەبێت رووبکەینە خوێندنەوەی ئووستوورەی سیسوفوس کە بەم رستەیە دەست پێدەکات: "بەتەنها پرسێکی فەلسەفی راستەقینە هەیە، ئەوەش خۆکوژییە". (ئوستوورەی سیسووفووس، ٣).

هەروەها، تێڕامانەکانی مۆرسۆ لە کۆتایی بێگانەدا دوو پرسیاری دیکەش سەبارەت بە دڵەڕاوکێ و دڵ بەدوایی تاکەکان بۆ دیتران دێنێتە پێشێ و کراوە و بێ وەڵام دەیانهێڵێتەوە. پرسیاری یەکەم پەیوەستە بە پرسی خۆخوازییەوە. تا چ رادەیەک تاکەکان دەست دەدەنە ئەنجامی کردارگەلێک تاکو وەڵامدەرەوەی خەون و بەرژەوەندی دیتران بێت-دیترانێک کە خۆیان لەخۆیاندا غایەت و ئامانجن- و بەتەنها مەبەستیان وەڵامدانەوەی بەرژەوەندییەکانی خۆیان نییە؟ پرسیاری دووەم بەندە بە ئەرکی ئەخلاقی بەنیسبەت دیترانەوە. تا چ رادەیەک تاکەکان دەبێت دەست بدەنە کردارگەلێک کە وەڵامدەرەوەی خەون و بەرژەوەندییەکانی دیتران بێت؟- دیترانێک کە خۆیان لە خۆیاندا غایەت و ئامانجن- و تەنها مەبەستیان وەڵامدانەوە و خزمەتی بەرژەوەندییەکانی خۆیان نەبێت؟

ئێستاکە ئیزنم بدەن ئەوە یاد بخەمەوە، کە ئەم پرسیارانە بە شێوەیێکی سەرنجڕاکێش بەند دەبن بە تێڕامانەکانی مۆرسۆوە سەبارەت بە مەرگ و پووچی ژیانەوە. ئەگەر، بەهەمان شێوە کە مۆرسۆ گریمانەی دەکات، ژیانی دوای مەرگ، یان پێکهاتێکی ئەخلاقی دەرەوەیی بوونی نییە و تاک، بۆ خەون و بەرژەوەندی دیتران بایەخێک دانانێت، کەواتە دەکرێت بە سانایی تێبگەین کە بۆچی مەرگ، ژیانی ئەو لە هەر جۆرە بایەخێک بەتاڵ و بۆش دەکاتەوە. پرسەکە تەنها ئەوە نییە کە ئەو بایەخێک بەوەی کە دوای مەرگی خۆی بۆ دیتران روو دەدات، نادات، بەڵکو ئەمەشە کە ئەو لە درێژایی ژیانیدا بایەخێک بە هەر جۆرە دۆخێک کە لە داهاتوودا کاریگەریی بەسەر خەون و بەرژەوەندییەکانی

ئەوەوە نەبێت، نادات. لەلایەکی دیکەوە، ئەگەر خەون و بەرژەوەندی دیتران- ئەو دیترانەی وا خۆیان غایەتن لە خۆیاندا-بۆ ئەو بایەخی هەیە، کەواتە بۆ هەر دۆخێکیش وا لە داهاتوودا و دوای مەرگی ئەو لەسەر ژیانی دیترانێک کە بۆی گرینگن، کاریگەری هەبێت، بایەخ دادەنێت، دوو نموونە بێننە پێش چاوی خۆتان. زۆربەی باوک و دایکەکان خۆیان دەکەن بە قوربانی داهاتووی منداڵەکانیان و بە چۆنییەتی ژیانی منداڵەکانیان دوای مەرگی خۆیان بایەخ دەدەن. زۆرێک لە لایەنگرانی پاراستنی ژینگە لێبڕاوانە هەوڵ دەدەن ژینگە بپارێزن، چونکە باوەڕیان وایە دەبێت سەرچاوەکانی گۆی زەوی لەگەڵ بەرەکانی داهاتوودا بەش بکەن و بۆ چۆنییەتی ژیانی ئەوانەی وا هەرگیز نایانبینن و نایانناسن بایەخ و گرنگی دادەنێن.

ئەم تێڕوانینە بۆ مۆرسۆ غەوارە و نەناسراوە. هۆیەکی نییە کە بیربکەینەوە کە ئەو دڵەکورک و دڵبەسراوی شتێکە کە بۆ دیتران لە دوای مردنی ئەو روو دەدات. ئەو، لە ئاستی خەون و خولیاکانی دیتراندا بەگشتی بێ بایەخ نییە، بەڵام توانایی ئەو بۆ هاوسۆزی نزمتر لە زۆربەی خەڵکە و باوەڕی نییە کە دەبێت دڵکورک و دڵبەستی خەون و خولیاکانی دیتران بێت. مۆرسۆ حەز دەکات ئەو دیترانەی کە لە هاودەمی و هاونشینی لەگەڵیدا خۆشن و چێژگر دەبن، خۆشنوود بکات، بەڵام خەون و هۆگری بۆ ئەو بەشە لە دیتران کە کەرتێک لە دەوروبەری ماکییانەی ئەو نییەن، دەدۆڕێنێت و لەدەستی دەدات... ئەو، دوای جێگۆڕینەوەی دایکی بۆ خانەی بەساڵاچووان بە دەگمەن دەکەوێتەوە یادی و هۆگری و سۆزدارییەکیش کە بۆ ماری هەیەتی لە درێژایی مانگەکانی زینداندا لەکیس دەدات. ئان و سات بەر لە دیمانەی قەشە: یەکەم جار دوای ماوەیەکی درێژ بیرم لە ماری کردەوە. رۆژگەلێکی زۆر بوو کە ئیدی نامەی بۆ نەدەنووسیم. ئەو شەوە بیرم لەمە دەکردەوە و لەگەڵ خۆمدا گوتم: حەتمەن لەوەی کە کچە هاوڕێی حوکمدراوێکی ئیعدامی بێت، تاقەتی تێکچووە. بیریشم لەمە کردەوە کە رەنگە نەخۆش، یان مردووبێت. لە دواجاردا لەم رووداوانە دەقەومێن. چۆن دەبوایا بزانم، چوون جگە لە تێکەڵبوونی لەشی هیچ شتێکی دیکە ئێمەی بە بیری یەکدی نەدەهێنایەوە. بەهەرحاڵ، دوای ئەم بیرکردنانە ئیدی ماری بۆم، هیچ بوو. (بێگانە، ١٢٣).

هەستی هاوسۆزی و دڵ بەدوایی ئەخلاقی مۆرسۆ بۆ دیتران، بە بەراورد لەگەڵ زۆربەی ئینسانەکان، بەڕاستی لاواز و نزمە. بەهەموو ئەمانەشەوە ئەو توانایەکی ئێرەیی بزوێنی، بۆ چێژوەرگرتن لە تانوپۆی ژیانی خۆی هەیە. کامۆ

له "هاوین له ئەلجەزیرە"دا دەنووسێت: "چێژخوازی، وزە و هەڵکەوتووییەکی تایبەتی دەوێت". (ئوستوورەی سیسووفووس، ١١٣).

مۆرسۆ ئەم هەڵکەوتوویی تایبەتەی هەیە. دەیوت: ئەگەر پێمل بایە کە "له کلۆری بۆشی دارێکی وشک هەڵاتوودا بژیبایە و کارێک بێجگە لەمەی کە چاو له ئاسمانی پشکووتووی سەر سەری ئەنجام نەدات... پێی رادێت". (بێگانە، ٧٧).

لەم رووەوە، مۆرسۆ عەنتیکەیەکی دیار و روون لەو وێنایەی پاسکاڵە کە له ئینسانی بێ خودا کێشاویەتی. مۆرسۆ لەوەی وا له ژوورەکەی خۆیدا بمێنێتەوە رازییە- تەنانەت ئەگەر ئەم ژوورە کلۆری بۆشی دارێک بێت. ئەو هیوایەتی سەفەر، بەسەرهات، یا چەشنەکانی تری هەڵگەڕان لەیادی تێدا نییە. کاتێک کە له دواجاردا "دۆخی لەرزۆک و تێپەڕمان بە وردی دەخاتە بەر بیرکردنەوە". ئەم دۆخە بە هۆکاری بەختەوەریمان دەبینێت، نەک بەدبەختییەکی بێ چارەسەر. هەر ئەم روانینە عەنتیکەیەیە کە وای لێدەکات له کۆتایی رۆمانەکەدا بگاتە هاودەنگی و هاوڕاییەکی ئاگایانە لەمەڕ "بێدەربەستی میهرەبانانەی جیهان"ەوە. (بێگانە، ١٢٢).

دوا پەرەگرافی بێگانە یەکێک له هەستبزوێنەرترین برگەکانە له تەواوی ئەدەبیاتی سەدەی بیستەمدا، بەڵام شیعری سادەی ئەم پەرەگرافە ئاڵۆزییەکەی پەردەپۆش دەکات. ئیزن بدەن با نیگایەکی وردتر و مووقەڵیشانەتر بەو رەگەزە جۆراوجۆرانە، کە ئەم پەرەگرافەیان پێکهێناوە، بکەین.

هەستم کرد وادیارە ئێستا تێدەگەم بۆچی ئەو (دایە) له کۆتایی ژیانیدا دەزگیرانی پەیدا کردبوو و بۆچی له نوێوە کایەکەی دەست پێکردبوو... دایە، کە ئەم هەمووە له مەرگەوە نێزیک بوو، حەتمەن هەستی کردبوو کە ئێستاکە ئازادە و تەیاری ژیاندنەوەی (تێهەڵچوونەوە) هەموو شتێکە. هیچ کەس، هیچ کەس نەدەبوو بەسەریەوە بگریایە. منیش وام هەستکرد کە تەیاری بووژاندنەوە و ژیاندنەوەی هەموو شتێکم.

ئەوەی وا ئەم دێڕانە پێمان دەگەیەنێت، بەتەنها رێزدانان نییە بۆ ژیان له هەمبەر مەرگدا، بەڵکو ئەم بۆچوونەشە کە مەرگ دەتوانێت ئێمە تەیار و ئامادەی "تێهەڵچوونەوە (ژیاندنەوە)ی هەمووشتێک" بکات. وا دێتە پێش چاو کە دەشێت کامۆ لەکاتی هەڵبژاردنی ئەم دەستەواژەیەی "تێهەڵچوونەوە (ژیاندنەوە)ی هەمووشتێک" تیۆرەی گەڕانەوەی ئەبەدی نیچەی له زەیندا بووبێت. کامۆ، ئەو سەردەمەی کە له خوێندنگەی ناوەندیدا بوو خوێندنەوەی بەرهەمە پڕخرۆش

و ناپێکهاتمەند (غیر سیستماتیک)ەکانی نیچە، ئەم فەیلەسووفە ئاڵمانییە کە ڕەسەنییەتێکی سەرسووڕهێنەری هەیە، دەست پێکردبوو. نیچە لە هەندێک لە نووسراوەکانیدا ئەم بیرۆکەیە دەخاتە بەر سەرنجەوە، کە جیهان کۆمەڵێکی کەم و تەنگەبەر لە وزەیە کە بە ڕێژەیەکی زۆر، بەڵام کورت لە حاڵەتانێکی مومکین و شیاو (یان لێکدراو)دان. نیچە دەڵێت: سەرئەنجام هەموو ئەم زنجیرە حاڵەتانەی شیاو و مومکین دەگاتە کۆتایی و جیهان خۆی دووپات دەکاتەوە و دیسان تێهەڵدەچێتەوە (دەژێتەوە). ئەم ڕووداوە جارێک نا، بەڵکو بەجارەها دێتە گۆڕێ. ئەمەی کە نیچە ئاوەها بیرۆکەیەک لە پێگەی تیۆرەیەکی کەونناسانە بەجیددی گەڵاڵە کردبێت، یان نا، جێگەی هەڵوێستە و گومانە، بەڵام لە ئاکامدا وەکو ئەزموون و تاقیکردنەوەیەک بۆ داکۆکی و داسەپاندنی ژیانی خۆی سوودمەند بینییەوە. بۆ نموونە لە زانستی شاد (The Gay science)دا داوا لە خوێنەر دەکات کە وێنای ئەوە بکات کە ئەگەر لە ساتی تەنهایی ڕەهاماندا شەیتانێک دەرکەوتبایە و پیشانی بدایە کە بچووکترین وردەکارییەکانی ژیانمان دەقاودەق بە هەمان شێواز و تەکوزییەک کە هەبووە، زۆرتر لە جارێک دووپات دەبێتەوە. ئایا ئاوەها شتێک دەمانڕووخێنێت؟ یان لێوانلێومان دەکات لە شادی؟ نیچە دەڵێت، زۆربەی تاکەکان لە دەرئەنجامی ئەم ڕووبەڕووبوونەوەیەدا تێکدەشکێن و دەڕووخێن. تەنها ئەو تاقانە ئینسانانە نەبێت کە نە نیگایان بۆ خودی ژیان خەماوییە و نە نیگایشیان بۆ ژیانی خۆیان، لەم ڕووبەڕووبوونەوە و کەشفەدا نوقم و شەلاڵی شادی دەبن.

بەهەرحاڵ، سەرکەوتن و سەروەری مۆرسۆ بۆ ئەوەی کە بەبێ داخ و دوو ژیان بکات، بنەمایەکی بەتەواوەتی جیاوازی لەو بنەمایە هەیە کە نیچە وێنای کردووە (ئەلەکساندێر نیاماس (Alexander nehamas) لە کتێبی نیچە: ژیان وەکو ئەدەبیات (Nietzche:Life as Literature) خوێندنەوە و شرۆڤەیەکی سەرنجڕاکێشی بۆ ئەم بابەتە هەیە). لە ڕوانینی نیچەدا، بنەمای درووستی دەسەڵات، ئیرادەیەکە کە ئینسان لە ڕێگەی هاوئاهەنگبوون لەگەڵ بزوێنەر و هاندەرەکانیدا بەدەستی دەهێنێت. ئەمە بە مانای زاڵبوون بەسەر خۆ و بەسەر خۆدا شکانێکە و خەلق و داهاتنی خودێکی یەکتا و تاقانەیە، بەڵام لەمەڕ مۆرسۆوە بەڕاستی ناکرێت بگوترێت کە بەسەر خۆیدا شکاوەتەوە و زاڵ بووە، یان خۆی داهێناوەتەوە. مۆرسۆ تەنها دەگاتە هەواری ناسینی خۆی. ڕووبەڕووبوونەوە/ پێلێنانی ئەو لەگەڵ قەشەدا بوار و دەرفەتی ئەوە دەدات کە بە ڕووناکی ببینێت،

که چ شتێک لەم ژیانە خاکی و زەمینییە لە پێگەی تێگەی هەستەوەرانە (درک حسی)دا بایەخی بۆی هەیە. بەپێچەوانەی زۆربەی ئینسانەکانەوە، بێدەربەستی جیهان بەنیسبەت هەوڵ و تێکۆشانی مرۆیی بۆ دۆزینەوەی مانا و هومێد، بۆ ئەو هیچ بایەخێکی نییە. ئەو، بەهیچ شێوەیەک خوازیاری یەکتایی و یەکگرتوویی و فامکراوەیی ژیان نییە، پێویستییەکی نییە ئەمڕۆی بە رابردوو و داهاتوویەوە گرێ بدات. ئەو، جیهان زۆر لە شێوەی خۆی دەزانێت و هەر ئەمەش شادی دەکات، "دڵم بە رووی بێدەربەستی میهرەبانانەی جیهاندا کردەوە. بینیم کە جیهان بە شێوە چەندە لە خۆم دەچێت-وەکو برام وایە-و هەستم کرد بەختەوەر بووم و جارێکی دیش هەر بەختەوەر دەبم".

بەڵام رستەی کۆتایی رۆمان نەوایەکی نوێ و دژبەرانە دەخولقێنێت: بۆ ئەوەی هەموو شتێک لەبار و تەبا بێت و من کەمتر هەست بە تەنهایی بکەم، تەنها ئەمە مابوو کە هیوا بخوازم کە لە رۆژی لە سێدارەدانمدا بینەرگەلێکی زۆر هەبوون و بە زایەڵەی نەفرەتەوە پێشوازیم لێ بکەن.

لەمەدا چی دێتە دەستمانەوە؟ لە ئوستوورەی سیسوفوس-دا، کامۆ پێداگری لەوە دەکات کە خوارکردن چەندە بۆ ئینسانی پووچ لە رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ دوژمندا بایەخی هەیە و چەندە هێز و وزەی دەداتێ. دەڵێت بە دەسەڵاتی خوارکردن، تەنانەت دەتوانین بەسەر باری پڕووکێنەری بەردی سیسوفوس-دا زاڵبین. "شتێک نییە کە نەتوانرێت بە خوارکردنی بە سەریدا زاڵ ببیت". (ئوستوورەی سیسووفووس، ٩٠).

بەڵام لە بێگانەدا ئەم ئەندێشەیە تا کۆتایی رۆمانەکە نایەتە کایەوە و دواتریش نابینین کە لە کردار و پراکتیکدا چی دەکات. مۆرسۆش پووچی دەژێت، بەڵام سەرکەوتنی لە ژیانی بێهیوای فشۆک و وەهم و وڕێنەدا سەرچاوەی لە بێدەربەستییەوە هەڵدەقوڵێت، نەک زاڵبوون. ئەو زۆرتر وێکچووی کەسایەتی چیرۆکی "هونەرمەندی برسی"[٣] (The hunger Artist) کافکایە، کە دەتوانێت هەرچەندە کە بیەوێت بەڕۆژوو بێت-تەنانەت تا سنووری مەرگ- چوون هەرگیز چێشت و پێخۆرێک نابینێتەوە کە بەدڵی بێت. هونەرمەندی برسی هەڵکەوتوویی و شێوەیەکی تایبەتی ژیاندن دادەهێنێت، کە لەسەر بنەمای بێحەزی ئەوە بۆ پێخۆر، بەڵام ئەم بێحەزییە لە زۆربەی ئینسانەکاندا نییە. مۆرسۆ ئینسانێکی پووچە و بەهۆی راستی رەهایەوە قارەمانێکی پووچە، بەڵام عەنتیکەتر و نەگونجاوترە لەوەی ببێت بە ئایدیال و سەرچەشنی ئەوانی تر. بەهەرحاڵ، ئەم فەرمانبەرە

ڕۆژانەیە یەکێکە لەبەرچاوترین ئەزموونەکانی کامۆ بۆ نواندنەوەی جیهان بینی پووچ لە ڕۆچنە و دووتوێی ژیانی تاکێکەوە. کامۆ لەو دوو بەرهەمەی پەیوەست بەم تریلۆژی (سێیانە) پووچییەیدا پەرژاوەتە سەر رووخسار و پێرسۆناژ گەلێک، کە بلیمەتی و سەرنج فڕێنی زۆرتریان هەیە- ئیمپراتۆرێکی رۆمی و پاشایەکی ئووستوورەیی فێڵباز.

**پەراوێز:**

١-لە روانینی فرۆیدەوە یەکێک لەو پێکهات و رۆنراوانەی کە لە گەشە و پێگەییشتنی کەسایەتیدا رۆڵی سەرەکی دەگێڕێت.

٢-"پاگانی" دەربڕینێکە کە یۆنانییە کەوناراکانیان پێ ناوزەد دەکرد و بە مانای جۆرێک لە "ئیلحادی فەلسەفی" دەکار دەکرا.

٣-"ئەوبەرتر" رەنگە لەڕووی ماناناسییەوە هاوپرسەکی لەگەڵ چەند وشەیەکی وەکو لەپێشتر و لەدواتر و لەوبەرتر و لەپاشتر... بێت کە لێرەدا من بە مانای ئەوەی کە مرۆڤ لە دۆخی بژاردنی دوو شتدا دەکەوێتە هەڵبژاردن و بەرتردان، یان بەرتردانی یەکێک لەو دووشتە، بەکارم هێناوە. کە ئەم هەڵبژاردن و بەرتردانە گرنگییەکەی لە ئاستێکدایە کە دەشێت هەموو جیهانبینی مرۆڤ بخاتە ژێر کاریگەرییەوە. ئەم وشەیەم لە هەرێمەکانی دەوربەری رۆژئاوای کرماشان و بەتایبەتی لە دێهاتەکان بیستووە.

٤-دۆزەخ لێرەدا بە واتایەکی دینی رەها نایەت، بەڵکو مانایەکی مرۆیی و زەمینی دەخاتە روو، کە بە زەق و چەقی لەسەر ئازار و رەنجی وجوودی مرۆڤ پێکدێت، بۆ فرەڕەهەندکردنی ماناکانی دۆزەخ دەتوانن کتێبی "خوێنەری کوشندە"ی بەختیار عەلی کە کۆمەڵە وتارێکە، چاو لێ بکەن. لە وتارەکانی ئاخریدا لە سەردێڕی "دۆزەخ لە ناوماندا" لەژێر کاریگەری هونەری نیگارکێشان مەدلوول و ئاماژەدراوەکانی دۆزەخ دەخاتە رەوتێکی جێگۆڕکێی و ئەملاولا پێکردنەوە.

٥-فەیلەسووفێکە کە دەڵێن لە ساڵی ۲۰۳یان ۲۰٤ی زاینی لە میسر لەدایک بووە، کە سەرەتا لە قوتابخانەی مامۆستایانی ئەسکەندەرییەدا بەدوای پرس و پرسیارە فەلسەفییەکانیدا رۆشت، بەڵام لەوێ بێ هیوا دەبێت و دواتر لە رۆم دەگیرسێتەوە و درێژە بە خواستە فەلسەفییەکانی دەدات.

٦-گنۆسییەکان رێباز، یان زۆرتر ئایینێک 'بەواتای دینی' بوو کە دوو سێ سەدە دوای مردنی عیسا مەسیح لە پانتایی ئیمپراتۆریی رۆمدا زاڵ بوون. گنۆسی وشەیەکی یۆنانییە کە بە واتای زانست دێت و مەبەستی ئەو رێبازە زانستگەلی سرۆک و رازاویانە بووە.

٧-ئاگۆستینووس هزردینییەکی یۆنانی بوو، کامۆ پێی وایە کە دنیابینی ئاگوستینۆس سەنتیز و بەرهاتی ئەندێشەی یۆنانی و ئەندێشەی مەسیحییەتە.

٨-جووان چاوگەی جوواندن و جووێتە و لە ناوچەی جوانرۆ و سەلاسی باوەجانی بەکار دەچێت و زۆرتر بۆ کارێک کە دەبێت بە زوویی "ئەنجام"بدرێت، هەروەها بۆ راژەنینی لانکەی منداڵیش بەکاری دەبەن، واتە دەڵێن: "ئەو بێشکەیە بجووێنە". تێگەی من لەم وشەیە: "هەر هەوڵ و کۆششێک کە بۆ دەسپێکێکی گورج و ئازایانە و لەپڕایی، واتە لەناکاودا لە بازنەی مەدلوولی جوواندندا سەیر دەکات".

٩-ناوی بەرهەمی فەیلەسووفێکی ئیسلۆڤێنیایی بە ناوی ئیسلاڤی ژیژەکە.

١٠- دەگێڕنەوە کە کایەیەکی ئەفسانەییە لە ناوچەی کرماشان و دەوروبەری کە منداڵ و بڕێجار گەورەکانیش دەیکەن، کە ئەویش ئەوەیە کە کەسی کایەکەر ئەوەندە بە دەوری خۆیدا دەسووڕێتەوە و دەسووڕێتەوە تا روانینی بۆ دنیا گۆڕاو و سووڕاو دەبێت، لەوکاتەدایە کە خودای جەڕیان، یان سووڕان، واتە باوکی ئەم کایەیە لە هەمبەرتا دەردەکەوێت و لەگەڵت دەئاخڤێ. ئەم کایەیەش هەر لە ناوچە سۆرانی زمانەکانی پارێزگای کرماشان بیستوومە.

# چیرۆکی کیژە کوردێ لە جەزیرە

و. کارزان محەمەد



هێمنی موکریانی لە سەرەتای یادداشتەکانیدا (لەکوێوە بۆ کوێ) دەنووسێ: بڕیارم دا سەرگوزەشتەی خۆم بنووسم... تەماشام کرد دەبێتە چیرۆکێکی درێژ و شیرین و پڕ کارەسات، چ چیرۆکێک لە بەسەرهاتی ئینسانێک لە واقیع نزیکترە؟

کەواتە ئەو چیرۆکانەی راستەقینەن و تەنها هەڵقوڵاوی خەیاڵی نووسەر نین، دەشێ لە ژیانی مرۆڤدا زۆر کاریگەرتر بن، ئەم بەسەرهاتە راستەقینەی "ئەلیا"ی کیژە کوردیش کە لە ساڵی (١٨٣٩ز)دا لە جەزیرە و بۆتان روویداوە، خۆرهەڵاتناسی ناسراوی فەرەنسی (کۆنت دۆسێرسی) ئەو ساتەی سەردانی کوردستانی کردووە، لە یاداشتەکانیدا دەیگێڕێتەوە.

دوای خوێندنەوەی ئەم چیرۆکەش دەپرسم داخوا چەند چیرۆکی راستەقینەی لەو چەشنە لە کوردستان روویدا بێت، تەنانەت بەنێو خەیاڵی شاعیران و هەستی چیرۆکنووسانیشدا راگوزەری نەکردبێ؟. (و- ک)

***

**سەردانێ بۆ جەزیرە**

شوێنەوارەکانی (جەزیرە) زۆر سەرنجڕاکێشن و شایستەی ئەوەن پشکنینیان لەسەر ئەنجام بدرێت. بەلای منەوە کە گەشتیارێکی سادەی بێ زانیاریم و تەنها هەست و بیرەوەری و یادگارییەکانم دەخەمەڕوو، پێموایە پتەوی ئەم شوێنەوارانە و تاشەبەردە سەرنجڕاکێشە رازێنراوەکان و نەخش و نیگاری دیوارە بەرزەکانی شیاوی سەرنجن... ماوەی دوو کاتژمێر سەرجەم گۆشە و قوژبنی شوێنەوارەکانمان تەی کرد، زۆرینەی هۆکاری وێرانبوونەکەشی پتر بە دەستی مرۆڤ ئەنجام درابوو، نەک سروشت.

بەدرێژایی ماوەی گەشتەکەم، کاپتن (ئەیکس)ی هاوڕێم گوتی زانیاریم لەسەر هەموو شوێنەکان هەیە، هەر ئەویش رێنمایی منی بۆ نێو کوچەو کۆلانی شوێنەوارەکان کرد، گوتیشی یەکەمجارم نییە ئەم کارانە بە ئەنجام بگەیەنم.

ئێمە گەیشتینە بەشی خۆرئاوای بورج و شورای دێرینی شاری جەزیرە، کەمێکمان بەرەو رێڕەوی ژێرزەمینەکە مابوو لەناکاو لەبەرامبەر دەرگایەکی گچکەدا کە بە ژوورێکی تاریک کۆتایی دەهات، سەرنجم دا کاپتن (ئەیکس) راوەستا و رووخساری شێوەیەکی غەمبارانە و نامۆی بەخۆوەگرت.

من تا ئەو ساتەش بەو چەشنە کاپتن (ئەیکس)م نەبینیبوو، هەربۆیە لەلام سەیر بوو و هۆکارەکەیم پرسی.

کاپتن (ئەیکس) بە ماتییەوە گوتی: "سێ سالْ لەمەوپێش و لەم وێرانەیەدا کارەساتێک هاتەپێش کە هێشتا لە یادەوەریمدا ماوە". پاشان پارچە پایەیەکی شکاوی بەمن نیشان دا تا لەسەری دابنیشم و گوتی: ئەگەر کاتت هەیە ئەوا بەسەرهاتەکەت بۆ دەگێڕمەوە.

دیارە من بە حەز و خولیایەکی بێ وێنەوە ئەم پێشنیازەم پەسەند کرد. ئێمە لەسەر ئەو پایە شکاوە دانیشتین، پاش کەمێ بێدەنگی کاپتن (ئەیکس) بە خەندەیەکی تاڵەوە وتی: هەروەک ئەمڕۆ، هاتمە ئێرە تا بنۆڕمە شوێنەوارەکانی ئەم بینا کۆنانە. تەنها بووم و وابڕیار بوو بەلەمەوانێ بمگەیەنێتە بەغداد، بەلام بەلەمەکەی هێشتا تەواو نەببوو. خۆت دەزانی ئەم بەلەمانە بە چەند پارچە دارێک دروست دەکرێن، کە لەسەر کۆمەڵێک چەرمی پڕلەهەوا دادەنرێن. لەلایەکی بەلەمەکەوە جۆرە چەترێکی تیادا رێکدەخەن تا گەشتیاران لەسەری دابنیشن. ئەو کەسانەی بەلەمەکە لێدەخوڕن، بەڕووتی لەسەر تەختەی سەر بەلەمەکە دەخەون. بەلەمەکە زۆر بەخێرایی بەسەر رووبارەکەدا دەڕوات، بەم چەشنە گەشتەکەت لە چوار تا پێنج رۆژ زیاتر درێژە ناخایەنێت، لەکاتێکدا بە رێگەی

وشكایی دا پتر لە (١٠) رۆژمان پێدەچێت.

کاتێک بەلەمەکەیان بۆ سازدام، چوومە سەردانی فەرمانڕەوای شارەکە و بە میهرەبانییەوە پێشوازی لێکردم و داخوازی ئەوەی خستەڕوو کە بەر لە گەشتەکەم نانێکی لەتەکدا بخۆم.

من پێشنیازەکەی ئەوم پەسەند کرد، چونکە هێشتا کاتمان زۆر بەدەستەوەبوو بۆ شام. هاتمە ئەم وێرانانە، بەشێکی گرنگی گەڕام و دەمویست بچمە نێو تەلاری ئەم ژێرزەمینەوە، لەناکاو سەگێکی هەوشار لەنێو ئەم دەرگا گچکەیەدا دەپەڕی و پەلاماری دام تا نەهێڵێ بچمە ژووری.

سەرەتا خۆم کێشایە دواوە، پاش کەمێ ئارەقەی شەرمەزاریم دەردا و سەرلەنوێ بەرەو دەرگاکە چوومەوە. ئەو سەگە توڕەیە جارێکی دیکە پەلاماری دامەوە. منیش دەمانچەکەم هەڵکێشا و نەڕاندم ئەگەر ئەم سەگەم لێ دوورنەخەنەوە، ئەوا دەیکوژم.

بەپێچەوانەی ئەو هاوارە توڕەیەمەوە، دەنگی ژنێکم بیست کە بانگی سەگەکەی کرد و ئەویش چووە نێو کولانە تاریکەکەوە و ئیدی دەنگیم نەهاتە بەرگوێ، بەڵام دوای بیستنی ئەم دەنگە، سەرم سوڕما چۆن دەشێ ئەو دەنگە سازگارە لەم کەلاوە چۆڵەدا ببیسترێ. چوومە نێو ئەو کولانە گچکەیەوە و لەنێو تاریکیدا رۆچووم.

کاتێ چاوم بە تاریکییەکە راهات، لە سوچێکی ژوورەکەدا کیژێکی تەمەن (١٢تا ١٤) ساڵەم بینی کە لەسەر رووی بڕە کایەک هەڵاژا بوو، ئەو سەگەی دەیویست پارچە پارچەم بکات، لەنێو باوەشی خۆی گرتووە.

کاپتن (ئەیکس) درێژەی دایێ: تۆش پێتوایە ئەمە رێکەوتێکی سەرسوڕهێنەر بووە؟ ویستم لەو کیژە جوانە بپرسم، بەڵام خۆی هاویشتە بەرپێم و دەستەکانی راموسیم و باوەشی پێداکردم تا زیانی پێنەگەیەنم. دەنگێکی لەڕولاوازی هەبوو، بەجۆرێ کڕوزایەوە کە بە راستی منی خستە ژێر کاریگەرییەوە. دەستەکانیم گرت و گوتم مەسیحیم و بەئێرەدا دەڕۆم و لە ئەوروپاوە هاتووم و نامەوێ زیانت پێبگەیەنم. ئەوەی توانیم پێمگوت تا ببمە جێ متمانەی.

کیژەکە ماوەیەک دڕدۆنگانە تێڕاما، چونکە زۆر لاواز ببوو نەیدەتوانی بڕیار بدا، بەڵام بەهۆی هیوابڕاوی و ئەو ناوبانگەش کە ئەوروپییەکان لە خۆرهەڵاتدا هەیانە، سەرلەنوێ پەلاماری پێڵاوەکانمی دا و کڕوزایەوە جێی نەهێڵم و گوتی دوو رۆژم بە برسێتی بەسەر بردووە و بڕستی لێ بڕاوە. من ویستم بۆ ساتێ جێی بهێڵم و تێشوویەکی بۆ ئامادە بکەم، چونکە زۆر بەبرسی دەهاتە بەرچاو،

وەلێ بۆ چەند چرکەیەکیش نەیهێشت لێی جودا ببمەوە. ئەو ئومێدەی لە دڵدا بوژابۆوە رزگاری دەبێت و دەترسا جارێکی دیکە دووچاری ئەو کارەساتە ببێتەوە کە رەنجی لەگەڵ کێشاوە، داوای لێکردم لەو شوێنە بیبەمە دەرێ و بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕامەوە.

ئەو کیژی سەرۆکی یەکێک لەو گوندانە بوو کە سەربە (جەزیرە)یە، ماوەیەک لەمەوپێش سەربازانی (حافز پاشا) کە ئەرکی سەرکوت و دامرکاندنەوەی کوردە شۆڕشگێڕەکانیان لەئەستۆگرتبوو، پەلاماری گوندەکەیان دابوو.

هەموو خەڵکەکە بەرەو چیاکان هەڵاتبوون، ئەم کیژەش ناوی (ئەلیا)یە و لەگەڵ خێزانەکەی خۆیدا پەنایان بۆ شوێنێ بردووە وایانزانیوە جێگایەکی ئارامە، بەڵام لەگەڵ چەند کەسوکارێکیدا بڕیار دەدەن بۆ گوندەکەیان بگەڕێنەوە تا کەلوپەلە جێماوەکانیان لەگەڵ خۆیاندا بهێنن کە بەردەست سەربازانی لەشکری عوسمانی نەکەوتووە.

لەبری ئەوەی بچنەوە گوند، دەکەونە داوی کۆمەڵێک چەتەوە کە بەگشتی لە پشت سەربازانی عوسمانییەوە دەهاتن تا گوندە کوردییەکان تاڵان و چەپاوڵ بکەن. (ئەلیا)ش لەلایەن سەربازێکەوە بەدیل دەگیرێت، سەربازەکە بەڵێنی دەداتێ ئەگەر شوێنی خێزانەکەیان پێ بڵێت، ئەوا دەیباتەوە بۆلای خێزانەکەی خۆی. پاشان کیژۆڵەکە هەڵدەداتە سەرپشتی ئەسپەکەی و بەدرێژایی شەو رێگا دەبڕێ، دوای خۆرهەڵاتن چەند کاتژمێرێ پشوو دەدەن و سەرلەنوێ بە رێگادا دەڕۆن. هەربۆیەشە (ئەلیا) هەست دەکات سەربازەکە بەو رێگایەدا ناڕوات کە ئەم نیشانی داوە تا بگەنە خێزانەکەیان. هەرچەند (ئەلیا) لە سەربازەکە دەپاڕێتەوە تا ئازادی بکات، هیچ ئەنجامێکی نابێت و سەربازەکە پێی دەڵێت: من خاوەنی تۆم و هەر فەرمانێکم بەسەردا سەپاندیت، دەبێ جێبەجێی بکەیت.

بەدرێژایی شەو بە رێگاوە دەبن، رۆژی دواتر دەگەنە (جەزیرە)، ئەم سەربازە دڕندەیە هەرلەوێ کیژەکە دەباتە لای پیرەمێردێکی تورک و بە (٤٥٠ پیاستەر) پێی دەفرۆشێت. پیرەمێردەکەش بەهۆی نەبوونی سەروەت و سامانەوە، تەنها لەگەڵ پیرەژنەکەیدا ژیان دەباتەسەر. ئەم پیرەژنەش بەهاتنی کیژێکی جیحێڵ و گەنجتر بۆلای مێردەکەی بەتەواوەتی جاڕس دەبێت، بەشێوەیەکی بەدڕەفتارانە و وەک کارەکەرێک مامەڵە لەگەڵ کیژەکەدا دەکات.

دوای تێپەڕینی شەووڕۆژێک، کیژەکە هەست دەکات درەنگ یاخود زوو

دیجلە ئەو بهێنێت، ئەلیا بە چانسێکی زێڕینی دەزانێ و هەڵدێ و دەچێتە ناو ئەم کاولە خانووەوە، خۆی لەو ژوورەدا حەشار دەدات کە من باسم کرد، چونکە دەیزانی ئەگەر لێرە بچێتەدەرێ ئەوا دەستگیری دەکەنەوە، حەز دەکات هەر لەو کاولە خانووەدا بمرێت نەک پیرەمێرد و پیرێژنەکە ئازارو ئەشکەنجەی بدەنەوە.

ئەم کیژە وێڕای برسێتی، لە چاوەڕوانی مردندا لەو کەلاوەیەدا دادەنیشێ تا بەڵکو خودای مەسیح (چونکە ئەلیا هەروەک زۆرینەی دانیشتوانی ئەو ناوچەیە مەسیحی بووە)، یارمەتی بدات و کۆمەکی بۆ بنێرێت.

هەرچەندە بەپێی گوتەکانی (ئەلیا) دەربارەی خۆی، پێموایە دەربازکردنی ئەو بێ دەردەسەری نابێت، دەمزانی بەپێی یاساکانی تورک، ئەو مەسیحییانەی پەیوەندییان بە کچانی موسڵمانەوە بێت، ئەوا بە مەرگ سزا دەدرێن، منیش نەمدەتوانی بیسەلمێنم (ئەلیا) مەسیحییە.

بەم حاڵەوە بەئەرکی سەرشانی خۆم دەزانی دەربازی بکەم، هەرگیز ئەوە بە خەیاڵمدا نەهات لەو شوێنەدا (ئەلیا) بەو دۆخە پڕ مەینەتییەوە جێ بهێڵم.

من بەرەو نزیکترین شوێنی رووباری دیجلە و بۆلای ئەو کەسانە رۆیشتم کە سەرقاڵی سازدانی بەلەمەکەم بوون، کرێکارەکان سەرقاڵی کار بوون، بە دەست ئاماژەم بۆ یەکێک لە کرێکارە دڵسۆز و بەوەفاکانم کرد و پێمگوت بەبێ ئەوەی کرێکارەکانی دیکە بزانن، ئەو کچە بخەرە نێو بەلەمەکەوە تا رزگاری بکەم. سەرەتا کرێکارەکەم نارد بۆ خواردن و تێشووم بۆ ساز کرد و بڕێکم دایە ئەلیا تا هێز و بڕستی لەدەستچووی بۆ بگەڕێتەوە. پاشان نۆکەرەکەمم بۆلای فەرمانڕەوای ئێرە نارد تا ئاگاداری بکەمەوە نانی ئێوارە لەگەڵ ئەودا ناخۆم و بڕیارم داوە ئەو ماوەیەی لەبەردەمدایە، بە بەلەمەکەمەوە سەرقاڵ ببم.

کاپتن گوتی: ئەگەر دەزانی لە ساتی سواربوونی بەلەمەکەمدا چیم بەسەرداهات! کاتێکم بۆ رۆیشتن دەستنیشان کرد کە بە گشتی تورکەکان لەو ساتەوەختەدا دەخەون، بەڵام دەمزانی ئەگەر یەک کەس هەتا منداڵێکیش، من ببینێ ئەوا لەوانەیە رووداوێکی ناخۆش بێتەگۆڕێ. هەروەک گوتم، پێموابوو لەلایەن خوداوەندەوە بۆ قوتاردانی ئەو کیژۆڵەیە راسپێردراوم و بەرپرسیارێتی هەر کارەساتێکیش ئەگەر روویبدایە، دەمخستە ئەستۆ.

(ئەلیا) لەکاتێکدا دەلەرزی، کۆڵوانەکەی پشتم تێوەپێچا. بەنێو ئەو سەرەونشێوییەی بۆ دیجلە دەچوو، کەوتمەڕێ. هەر هەنگاوێکم دەنا، خورپەیەکی لەنێو دڵم دەدا...

سەرەنجام دوای چارەکە کاتژمێرێ کە پێموایە سەدەیەکی خایاند، گەیشتمە

بەلەمەکەم و گوریسەکەیم کردەوە، چونکە بە کەناری رووبارەکەوە شەتەکم دابوو، تیژڕەویی ئاوەکە ئێمەی لە مەترسی قوتار دا.

چەند کاتژمێرێ دواتر، خێرایی ئاوەکە ئێمەی بە تەواوەتی لە (جەزیرە) دوورخستەوە و خەیاڵم پشوویەکی دا. پێموابوو ئەو کیژە بەدبەخت و چارەڕەشەم لە مەرگ پەڕاندۆتەوە و لە ناخمدا هەستم بە ئاسودەیی دەکرد. رووخساری مەزڵومی ئەم کیژۆڵەیە، منی خستبووە ژێر کاریگەرییەوە. غەمی نێو چاوە رەش و قەشەنگەکانی و پرچ و ئەگریجەی سەر رووخساری، هەروەک دیمەنێکی هێندە جوان خۆی دەنواند، کە نموونەی کیژێکی خۆرهەڵاتیانەی دەنواند.

لەو ساتەدا کاپتن دەنگی بڵندتر کرد و درێژەی دایێ: هەرگیز بەبیرمدا نەدەهات تێڕوانینێکی خودپەرستانەم بۆ ئەو هەبێت و لە بەهای ئەو خزمەتەی ئەنجامم داوە، کەم بکەمەوە. من خۆم بە کەسوکاری (ئەلیا) دەزانی و بڕیاری لێبڕاوانەم دابوو بەپێچەوانەی ئەوەی بچم بۆ بەغداد، ئەو بخەمە ژێرباڵی پشتیوانی کونسولخانەی وڵاتەکەمەوە، بەڵام چی بێ لە تۆ نهێنی! (ئەلیا) بەچاوی خاوەنێکەوە کە چارەنووسی ئەوی دەستنیشان کردووە، لە منی دەنۆڕی. سوپاس و ستایشی بێکۆتای دەکردم، لەم خۆرهەڵاتەدا ژنان خۆیان بە بەشێکی دانەبڕاوی پیاوان دەزانن، وەها دەردەکەوت ئەویش خۆی بە موڵکی من بزانێ.

دۆخێکی دژوار هاتەئارا، پێموانەبوو بتوانم لەم فیداکارییە بێ وێنەیە سەربڵندانە دەربازم ببێ. خۆر بەرەو ئاوابوون دەچوو، بەدڵنیاییەوە تۆش بەم رێگایەدا گوزەرت کردووە و بینیوتە ئاوابوونی خۆر چەندە رازاوەیە. لەو ساتەدا تیشکی خۆر دەدرەوشایەوە و لە ئاگردانێک دەچوو لەژێر زەبری چەکوشێکدا بێت، بەڵام ئەو هەموو قەشەنگییە لە ساتێک زیاتر ناخایەنێ و پاش کەمێ هەموو شتەکان لەنێو تاریکیدا رۆدەچن.

لە وڵاتانی ئەوروپایی لەنێوان رۆژ و شەودا، ساتێک هەیە کە نە رۆژە و نە شەو. لە خۆرهەڵاتی زەوی، تاریکی راستەوخۆ لەدوای خۆرئاوابوونەوە دێت و هەموولایەک دەگرێتە باوەش. ئەو جموجۆڵە کورتەی لەکاتی رۆژدا لەم دەڤەرە هەیە، لەگەڵ ئاوابوونی خۆردا بەگشتی لەنێودەچێ و هەموو لایەک دەچنە نێو بێدەنگییەکی قوڵەوە، هەروەک بڵێی پەردەی ژیان دادرابێتەوە.

بەلەمەوانانی دیجلە لەڕووی تەمەڵییەوە یاخود بۆ خۆپاراستن لە زیخ و چەوی کەناری رووبارەکە کە لێخوڕینی بەلەم دژوار دەکەن، دابونەریتیان بەچەشنێکە لە شەودا هاتوچۆ ناکەن و ناتوانرێ ناچاریشیان بکەی دوای

ئاوابوونی خۆر، درێژە بە بەلەمەوانی بدەن. هەربۆیە پێشنیازی ئەوەیان بۆ خستمەڕوو لە بەردەلانێکی لێواری ڕووبارەکەدا ڕابوەستین. شوێنەکە شێوەی لە بەندەرێکی سروشتی دەچوو، ئێمەش لەم پەناوپەسێوەدا کە شەپۆلەکانی ئاوەکە هیچ کاریگەری بەسەرەوە نەبوو، پشوومان دا.

گەرما و ناڕەحەتی منی شپرزە کردبوو، دەمویست تا هەواکە بەتەواوەتی تاریک نەبووە خۆم بشۆم، هاتمە لای (ئەلیا) و پێمگوت لە بەلەمەکە نەیەتەدەرێ، دەترسام یەکێک لە دانیشتوانی ناوچەکە بیبینن. کەمێ دواتر، لەسەروو بەرزاییەکەوە کە درێژایی دیجلەی لێوەدەبینرا، چوومە نێو ئاوەکەوە.

کاتێک هاتمەوە لێواری ڕووبارەکە، (ئەلیا)م بینی بەرەو لای من هەڵدەهات، بەهۆی دیارنەمانی منەوە ناڕەحەت ببوو و هاتەلام تا بمبینێ، بەلام لەو سەرپێچی و ناگوێڕایەڵییەی توڕە نەبووم. خۆشحاڵی ئەو بەهۆی بینینی منەوە و ڕەفتاری ڕێزدارانەی لەگەڵمدا، بەچەشنێ بوو کە پەشێوییەکەی خۆمم حەشار دا.

لە کەناری ڕووبارەکە نزیک بووینەوە و لەژێر درەختێکدا دانیشتین کە گەڵا هەڵوەریوە ڕەنگ زەردەکانی پەرتوبڵاوببوونەوە و دەدرەخشانەوە.

ساتێ لە جوانی ئەم دیمەنە تێپەڕی، لەناکاودا دەنگی ئێمە گەیشتە گوێی ڕێبوارێک کە بەو ناوەدا تێدەپەڕی، پاش کەمێک دوو پیاومان بینی، یەکێکیان جلوبەرگی سەربازیی لەبەردابوو. ئەوان ئێمەیان نەبینی، بەخۆپارێزییەوە هەنگاویان دەنا هەروەک بڵێی بنۆڕنە بەلەمەکەی ئێمە، چونکە بە ماتەماتەوە لە چواردەوریان دەڕوانی، هەستم کرد پیلانێکیان لەژێرسەردایە. (ئەلیا) لەناکاودا بە پەرێشانییەوە گوتی: "ئەمە هەمان ئەو پیاوەیە منی فرۆشت و ئەویتریشیان ئەو پیرەمێردەیە کە منی کڕی".

منیش تا ئەو ساتەش دڵی (ئەلیا)م دەدایەوە و پێم دەگوت هەرگیز جێی ناهێڵم، بە سپایی لەجێگەی خۆم ڕابووم، نازانم ئەو دوو پیاوە منیان دیتبوو یاخود بەڕێکەوت بەرەو لای ئێمە هاتن، سەرەنجام هێندە لە ئێمە نزیک ببوونەوە کە دەمانتوانی یەکتر ببینین. یەکسەر بەرەو لای ئێمە هاتن و پیرەمێردەکەیان بە منی گوت: "ئەی مەسیحی سەگ، لێرە لەگەڵ ئەو کچەی موڵکی مندا چی دەکەی؟ من پێموت ئەمە کچی تۆ نییە... دەزانم هەقی تۆ چییە... بەهەرحاڵ پێویست بە زۆرگوتن ناکات، ئەگەر پارەت دەوێ دەتدەمێ ئەگەرنا ئاگادارت دەکەمەوە کە بەرگریی لەم کیژە دەکەم".

ئەو پیاوەی لەگەڵ پیرەمێردەکەدا بوو گوتی: مردن بۆ مەسیحی! دوای ئەو گوتەیە، دەمانچەی لەبەر پشتێن هەڵکێشا و سێرەی لە من گرت، بەلام منیش

دەستبەجێ گوللەیەکم پێوەنا. گوللەکەی ئەو بەپەنامدا تێدەپەڕی، بەڵام بینیم (ئەلیا) بەسەر ئەژنۆمدا کەوتووە و دەلەرزێ. بەداخەوە ئەو گوللەیەی بەر من نەکەوت، لەسەر دڵی (ئەلیا)ی دابوو، قریشکاندی و کەوتە سەرزەوی. کاتێ ویستم (ئەلیا) لەسەر زەوییەکە بڵند بکەم، پیرەمێردەکە گوللەیەکی تەقاند و خۆشبەختانە چەکەکەی وەستا، منیش بە دواگوللە ئەوم لەپەنا لاشەی هاوڕێکەیدا گەوزاند.

دەنگی دەقە خەڵکەکەی بۆ شوێنەکە راکێش کرد، خوێنێکی زۆرم لەبەر رۆیی و لەپەنا لاشەی (ئەلیا)دا بێهۆش کەوتم. منیان بەئاستەم هێنایەوە هۆش، کاتێ چاوەکانم هەڵێنا، جەستەی بێ گیانی کیژۆڵەکەم لەتەک خۆمدا بینی و زۆر بۆ ئەم کارەساتە گریام. (ئەلیا)م لەنێو چاڵی پەنا درەختێکدا بەخاک سپارد، سپێدەی رۆژی دوایی کەوتینە رێ و دوای سێ رۆژ گەیشتمە بەغداد.

لەو ساتەدا کاپتن لەکاتێکدا گردۆلکەیەکی رەشی بە من نیشان دەدا، گوتی: "ببینە، لەو شوێنەدا رووداوەکە قەوما. سێ ساڵ بەسەر ئەو رۆژەدا تێدەپەڕێ، وێڕای ئەوەش بەچاوی خۆت دەبینی یاد و یادەوەریی ئەو کارەساتە هێشتا لام هەر زیندووە".

لێرەدا کاپتن بێدەنگی دایگرت و دوو دڵۆپ فرمێسک زایە نێو چاوەکانی، ئێمەش لەنێو ئەو بێدەنگییەدا هەمان رێگامان گرتەبەر کە کاپتن و ئەلیا پیایدا رۆیشتبوون.

هەمان شەو لەکاتێکدا دەمویست سواری ئەسپەکەم ببم، سەگێکی هەوشار هاوشێوەی سەگی (کۆس) کە لە بەریتانیا زۆرن، بە پەنا مندا تێپەڕی و بەحاڵەتێکی غەمناکانەوە بۆنی پێی ئەسپەکانمی دەکرد. من هێشتا بە بیستنی چیرۆکەکەی کاپتن وڕو کاس ببووم، سەگەکەم نەوازش کرد و لە یەکێک لە هاوکارەکانم پرسی ئەم سەگە هی کێیە؟ گوتیان هی کاپتن بەریتانییە. بە کاپتنم گوت ئەم سەگەت لە هیندستانەوە هێناوە؟ ئەو سەری بادا و گوتی: "نەخێر، ئەمە هەمان سەگەکەی (ئەلیا)یە و سێ ساڵە لە من دوورنەکەوتۆتەوە!"

**سەرچاوە:**

کنت دو سرسی، ایران در ١٨٣٩-١٨٤٠م، ترجمه احسان اشراقی، تهران، مرکز نشر دانشگاهی، ١٣٦٢.

# سێ= دوو پیاو و ژنێک



**ن: ئازەردوخت زیایی**

**و. لە فارسییەوە: جەواد حەیدەری**

وتی: لێرە راوەستە دەگەڕێمە. هەموو رۆژێ ئەم رستەیەی دووبارە دەکردەوە، دواتر دەچووە بەردەم پەنجەرەکە و چاوی لە پارکەکە دەبڕی. قەت نەچووم لە تەنیشتی راوەستم. لێم نەپرسی بۆچی ماندوو نابێت... لێم نەپرسی بۆچی ناگریت... نیگەرانی بووم... لە پارکەکە دادەنیشتم و پێموابوو کە سەیرم دەکات. دەتوانی هەر لە دوورەوە بیر و فیکری ئەو بخوێنێتەوە... چین و چیرۆکی ناوچاوانی... لێوەکانی دەکرۆشت... چاوم لە دیتنی ماندوو نەدەبوو.

ئەلبوومی وێنەکانی نیشانی من دابوو. هەموو بیرەوەرییەکانی ئەو لە چوارڕێیانەکان تەنها گڵۆپی سوور بوو. دەمزانی چوار ساڵە کاتژمێرەکەی قوڕمیش نەکردووە. دەمزانی حەز دەکات لەسەر پردێک راوەستێت و چاوەکانی خۆی داخات و لەو کاتەی کە دەیەوێت خۆی هەڵدا، کەسێک پێی بڵێ: (ئەو ئیشە مەکە).

باش لەبیرمە، کاتژمێر ٥ی ئێوارە بوو. لە خوار قادرمەکان راوەستابوو، گوێم لە شکاندنی سوراحی ئاوەکە بوو، زانیم ئەم سەفەرە، سەفەری بێ گەڕانەوەیە.
وتم: چاوەڕێم مەبە... چاوەکانی لێک نابوو...

دەنگی پێکەنینی منداڵەکان هەموو کەرەستەی یارییەکانی داگرتبوو... یەکێکیان دەگریا... خۆر ماڵئاوایی کردبوو... لە لای محاجەرەکان راوەستابووین... ویستم پاڵی پێوە بنێم... وای بیردەکردەوە کە من ئەوم خۆش ناوێت... هیچ کات بڕوای نەکرد... نەمدەویست بترسێت... دەمەویست دەستم بگرێت، بەڵام نەیگرت... تەنانەت دوێنێش کاتێک کە دەمویست لەمبەری شەقام بۆ ئەوبەری شەقام بپەڕمەوە، دەستی نەگرتم و دەستەکانی خستە ناو گیرفانی... هەوا سارد بووە... جامخانەکان پڕن لە بووکەشووشە... پیاوەکە یەخەی پاڵتۆکەی هەڵداوەتەوە، سەری خۆی بردووەتە ناوەوە... پیرێژنەکە گۆچانەکەی لێ بزربووە. دەستی دەگرم. لە شەقامەکە دەیپەڕێنمەوە. پیرێژنەکە پێم دەڵێت: یا خوا خۆشبەخت و بەختەوەر بی کوڕم...

دەگەمە پشت دەرگای ئەپارتەمانەکە... تۆزێک رادەوەستم، قاچی راستم لە پێشەوەیە. دەستم لەسەر زەنگی دەرگاکەیە. نە جارێک. نە دوو جار... نە سێ جار... ئەو ژمارەی (٣)ی زۆر خۆش دەوێ. هەمیشە سێ نوقڵی دەکڕی... یەکێک بۆ من... یەکێک بۆ خۆی... نوقڵێکی دەخستە ناو سندووقە دارەکەوە. پێم وت: ئەو سندووقە بیرەوەری من و تۆیە، بۆچی ئەو سندووقەت دا بە کەسێک کە رۆیشت و ئیتر قەت ناگەڕێتەوە... سەیری کردم. ویستی شتێک بڵێ. بڵێ لێرە راوەستە ئێستا دەگەڕێمەوە، بەڵام نەیگوت.

کە دەرگاکەی کردەوە، تاڵێک لە قژی سپی ئەو بە دەسکی دەرگاکەوە مایەوە... هەڵمگرت و خستمە سەر لاپەڕەی ٣٣ی ئەو کتێبەی کە لەسەر مێزەکە بوو... سەیرێکی کردم و بە تەشەرەوە زەردەخەنەیەکی کرد.

پۆلی سێی سەرەتایی بووین... لە قوتابخانە کە دەگەڕامەوە، چاوەڕوانم بوو. وتم: یاری بکەین؟ کتێبەکەی کردەوە هەرچی بە دوای لاپەڕەی ٣٣دا گەڕاین نەماندۆزییەوە... دەگریا... بەڵێنم پێدا کتێبێکی بۆ بکڕم کە ٣٣٣ لاپەڕەی هەبێت... جانتاکەی کردەوە...

پەردەکەکان هەموو داکەوتبوون. هەموو قەفەنەکان بە پارچەیەکی سپی داپۆشرا بوون. کورسییەکی شکاو لە لای پەنجەرەکە بوو. وەک هەمیشە لەسەر یەکەمین قەنەفە دانیشتم. بۆنی قاوە هەموو ماڵەکەی داگرتبوو. رانەهاتووم کە بانگی بکەم، بەڵام خۆی تێدەگات هەرکاتێک کە زانی من نامەوێ بڕۆم، لە ژوورەکەی دێتە دەرەوە و لێم دەپرسێ شتێک ناخۆی؟ بە پێچەوانەوە دەڵێم: بەڵێ، دەخۆم تکایە قاوە... سوپاس.

بەهۆی ئەم بۆنە ناخۆشەوە هەناسەم دەکزێنێتەوە... گۆڕانێک دەگرێت و

هێواش هێواش سەری بادەدا و خۆی رادەژێنێ... پێی دەڵێم ئەم وێنەیەتم لەناو کەلوپەل و شمەکەکانمدا دۆزیوەتەوە. لەبیرتە؟ بەیانی رۆژی هەینی بوو. ناهێڵێ درێژە بە قسەکانم بدەم، وێنەکەم لەدەست دەردێنێت و سەیری دەکات. لەوە دەچێ بەدوای کەسێک یا شتێکەوە بێت... دەستێکی بە دەوری کوپی قاوەکەدا دەهێنێت. پێموابوو کە هۆی لەرزینی دەنگی بەهۆی گەرمیی قاوەکەوە بوو... سەری داخستووە. سەیرم دەکات... بۆچی زووتر نەتوت؟ بۆچی منت بە تەنیا جێهێشت؟ نەمتوانی حەسرەتی خۆم بشارمەوە... بۆ یەکەم جارە کە چاوەڕوانی وەڵامی منە... منیش بێدەنگم.

چووبووم کە دیاری رۆژی لەدایکبوونەکەی پێ بدەم... کە گەیشتمە سەرەتای کۆڵان... بینیم کە لە ئۆتۆمبێل دابەزی... شۆفێرەکە کوڕێکی لاواز بوو کە قژێکی رەش و زۆری هەبوو... منی نەبینی. چووە ناو بیناکەوە... لێم پرسی نەتویست من ببینی؟ وتی: خۆ تۆ نەهاتیە پێشەوە هەتا بتبینم!

قاوەکەی خواردەوە... لەسەر جێگاکەی هەستا... موزیکەکە لە گەرمەی خۆی دابوو... بە قەدی دیوارەکەوە تابلۆی شێوەکاری پێوە بوو کە وێنەی دوو پیاوی نیشان دەدا کە یەکیان دەڕۆیشت و ئەوی تریان دەهات. کچێکیش لەپشت ئەوانەوە خەریکی پرچ هۆنینەوە بوو... هیچ کات ئاوا بە وردی ئەو تابلۆیەم نەبینیبوو...

**سەرچاوە:**

ماڵپەڕی (پیادەڕۆ)

http://www.piadero.ir/portal/index.php?do=post&id=677

# هاوسەفەر!



**نووسین: نادر ئیبراهیمی**

**و. لە فارسییەوە: یوسف عەلی پور**

لەم ڕێگا دوورودرێژەدا -کە ئێمە لێی ئاگادار نین و هەر بە خێرایی تێدەپەڕێت- لێگەڕێ با نەختە ناکۆکییەکانمان هەروا بمێننەوە. تکات لێدەکەم!

داوام لێ مەکە کە ببینە یەکێک، کتومت هەر لە یەکتری بچین.

داوام لێ مەکە هەرچییەک کە تۆ حەزت لێیە منیش هەر بەو ڕادەیە هەر حەزم لەو شتە بێت و بە پێچەوانەوە ئەوەی کە منیش خۆشم دەوێت بڵێم کە دەبێت تۆش خۆشت بوێت.

داوام لێ مەکە کە هەردووکمان حەزمان لە یەک ئاواز، یەک ساز، یەک کتێب، یەک تام و یەک ڕەنگ بێت و یەک شێوە تێڕوانینمان هەبێت.

هاوسەرفەری و هاوئامانجی، بە هیچ شێوەیەک بە مانای وێکچوون و

یەکبوون نین و وێکچوونیش نەک تەنیا نیشانەی پێکەیشتوویی نییە، بەڵکو نیشانەی ڕاوەستانە.

ڕەنگە "ناکۆکی" وشەیەکی باش نەبێت و شیاوی ئێمە نەبێت. ڕەنگە "جیاوازی" لە "ناکۆکی" باشتر بێت. نازانم، بەڵام هەرچۆنێک بێت ئەو یەک وشەیە کێشەی ئێمە چارەسەر ناکات.

کەواتە لێگەڕێ با بەم چەشنە باسی بکەم:

ئازیزەکەم!

ئەوە جیاوازیی بۆچوونەکانی ئێمەیە کە بونیاتنەر و پاڵنەری ژیانە، نەک وێکچوونەکانمان و لەناوچوون و توانەوەی یەکێکمان لەوی دیکەدا، نە خۆبەدەستەوەدان، گوێڕایەڵبوون، فەرمانبەر و بێ ئەملاو ئەولا قبوڵکردن.

سەردەمانێک من وتوومە: "عەشق لەبەریەک هەڵوەشانی یەکجارەکی تاکایەتییە لە کۆمەڵدا". ئێستا نامەوێت حاشا لەو چەمکە بکەم، بەڵام لێرەدا باس باسی عەشق نییە، باسی ژیانی هاوبەشە کە هەوێنەکەی دەتوانێت عەشق، یان خۆشەویستی و میهرەبانی یان ئاوێتەیەک لەوانە بێت. بەهەرحاڵ تەنانەت دوو کەسیش کە بە توندی و بێ هیچ چاوەڕوانییەک عاشقی یەکترین و عەشق ئەوانی بە دلۆڤانی پێکەوە گرێداوە، مەرج نییە کە هەردووکیان حەزیان لە قاسپەی کەو، لوتکەی کێو، ڕەنگی سوور، دەوریی گڵێن و... بێت، ئەویش ڕێک بەقەدەر یەکتری. ئەگەر وای لێهات -کە هەڵبەتە وای لێ نایەت- دەبێت بوترێت کە یان عاشق زیادەیە، یان مەعشوقەکە. یەکیان بەسە. عەشق تێپەڕینە لە لوتبەرزی و خۆپەرەستی، بەڵام ئەم قسەیە بە مانای بوون بە کەسێکی دیکە نییە.

من باسی عەشقێکی زەوینی دەکەم کە بەهاکەی لە "هەبوون"دایە، نەک لە فەوتان و توانەوەی یەکێک لەوی دیکەدا.

ئازیزەکەم!

ئەگەر ڕوانگەکانمان سەبارەت بە شتێک وەک یەک نین، لێگەڕێ با وەک یەک نەبن. لێگەڕێ با جیاواز بین. لێگەڕێ با لە هەمانکاتدا کە پێکەوەین، سەربەخۆ بین. داوابکە لە کاتێکدا پێکەوەین، با یەک نەبین. بخوازە کە یەکتری کامڵ کەین و پێ بگەیەنین، نەک یەکتری نابووت بکەین.

تۆ نابێ تارمایی سێبەرەکەی من بی

و منیش نابێ تارمایی سێبەرەکەی تۆ بم

ئەوە قسەیەکە کە سەبارەت بە "دۆستایەتیش" باسم کردووە.

لێگەڕێ با زۆر دۆستانە سەبارەت بە هەموو ئەو شتانەی کە ناکۆکیمان لە

سەریان هەیە، قسەوباس بکەین، بەڵام بەو نییەتەوە نا کە قسەوباسەکەمان بە خاڵێکی تەواو یەکدەستمان بگەیەنێت.

قسەوباس دەبێت ئێمە لە یەکتری تێبگەیەنێت، نەک ئەوەی کە لە ناومان بەرێت.

جا ئەوە بە کەڵکی چی دێت کە من سەرەڕای هەموو تاکبوونەکەم، نەبم و ئەتۆ هەبیت، یان بە پێچەوانەوە تۆ سەرەڕای هەموو بێ هاوتاییەکەت نەبیت و ئەمن هەبم؟

لێرە باس لە پەیوەندیی خواناس لەگەڵ خودا نییە، باس باسی تۆزتۆزەی ڕاستییەکان و حەقیقەتە بابەتی و باوەکانی ژیانە.

من "کامۆ"م لە سارتەر پێ باشترە و "سادقی"ش لە "ساعدی" بە باشتر دەزانم.

"باخ" بە باشتر لە "بێتهۆڤن" دەزانم و "عود"یشم لە سەرجەمی سازەکان پێ باشترە.

شاخم لە دەریا پێ باشترە و "دالی"یش لە "پیکاسۆ".

تەنانەت شاملو لە نیما بە باشتر دەزانم.

بەڵام تۆ ساعدی و "بەلزاک"ت زیاتر خۆش دەوێن.

پیانۆ و سەنتورت لە عود پێ باشترن.

نە خوازیاری "دالی"ی و نە پیکاسۆش. "ڤان گۆخ"ت لە هەردووکیان پێ باشترە.

شاملوت خۆش دەوێت، بەڵام قەد بە قەدەر سۆهراب خۆشت ناوێت.

دەریات خۆش دەوێت، بەڵام نەک ئەو دەریایەی کە دەبێت بە حەسرەتەوە لێی بڕوانیت...

وەرە با سەبارەت بە هەمووی ئەوانە قسەوباس بکەین!

وەرە با قسە بکەین!

وەرە با زانیارییەکانمان تاو دەین!

وەرە با جوابەجەنگی بکەین!

بەڵام سەرەنجام چاوەڕێی ئەوە نەبین کە بەسەر یەکتریدا سەرکەوین و ئەو سەرکەوتنە ببێتە هۆی ئەوەی کە تۆش وەک من بیر بکەیتەوە، یان بە پێچەوانەوە من وەکو تۆ بیر بکەمەوە.

تۆزێک نزیکبوونەوە لە نوقمبوون باشترە.

لێک تێگەیشتنیش لە خۆ بەدەستەوەدان باشترە.

تا کاتێک کە تۆ ساعدی و سۆهرابت پێ باشترن، ڕێک هەتا ئەو کات ساعدی و

سۆهراب بەرەو بیرکردنەوە و ناسین، بۆ زیندووبوون و جموجۆڵ هانم دەدەن. ئەگەر تۆ هەموو شتێکت وەک منی لێ بێت، من و تۆ، سۆهراب و ساعدی و زۆر کەسی دیکەمان لەناوبردوون...

ئازیزەکەم!

وەرە با تەنانەت ناکۆکییە بنەڕەتییەکانیشمان، لە زۆر بواردا، تا ئەو جێگایە بپارێزین کە هەست دەکەین دوانێتی شەوق و ژیان دەبەخشێت، نەک خەمۆکی و داماوی و مەرگ.

من و تۆ، تۆ و من، مافی خۆمانە کە لە بەرامبەر یەکتریدا راوەستین.

مافی ئەوەشمان هەیە کە زۆریەک لە بیروبۆچوونەکانی یەکتریش قبوڵ نەکەین، بێ ئەوەی کە مەبەستمان سووکایەتیکردن بێت بە یەکتری.

پێموایە ئەوە لە زومرەی ئەو دوایین مافەیە کە لەم جیهانەی ئێستادا بۆ مرۆڤەکان ماوەتەوە: مافی ئەوەی کە لە ماڵەکەی خۆتدا، لە هۆدەکەی خۆت و لە تەنیایی خۆتدا، سەبارەت بە زۆر شت و لەوانە سیاسەت و ئارمانە سیاسییەکان، جیاوازیی بیروڕا هەبێت.

ئازیزەکەم!

بەڕاستی کاتێک دوو لەت دەبنە یەکێک و لە دوو کوتی "تەنیا" "کۆیەکی تەواو" پێکدێنن، کە بتوانن کەموکوڕییەکانی یەکتری قەرەبوو بکەنەوە، نەک ئەوەی کە رێک هەر وەک یەکتریان لێ بێت، هیچ شتێک بە یەکترییەوە زیاد نەکەن و پرسی تایبەت و تازە نەهێننە گۆڕێ...

کەواتە، خاتوون!

وەرە با بڕیار بدەین هیچکات وەک یەکترمان لێ نەیەت.

وەرە با بڕیار بدەین کە جموجۆڵەکانمان، هەڵسوکەوتمان، قسەکردنمان و ویستەکانمان، بە تەواوەتی وەک یەکیان لێ نەیەت...

با مەجالێکیش بۆ ئەوە بێڵینەوە کە وردە ناکۆکییەکانمان و تەنانەت ناکۆکییە بنەڕەتییەکانیشمان هەروا بمێننەوە.

با هیچ کاتێکیش جیاوازیی بیروڕاکانمان نەکەینە ئامرازێک بۆ هێرشکردنە سەر یەکتری...

ئازیزەکەم! وەرە با جیاواز بین!

**سەرچاوە:**

وەرگیراو لە کتێبی: چل نامەی کورت بۆ هاوسەرەکەم.

# لە دنیای بۆدلێر-ەوە



دەق: چارلس بۆدلێر

و. لە ئینگلیزییەوە: سۆران محەمەد

## پاییز

بەم زووانە خۆ دەهاوێژینە نێو سێبەرەساردەکانەوە و
هەموو دوا نیوەڕۆ سەرسامکەرەکانی هاوین دەڕۆن.
من پێشوەخت گوێم لە زرمەی مردنی دارەبڕاوەکانی خوارەوە بوو
کەوتنە سەر بەرد و گیاکان.

هەموو زستان ئەگەڕێتەوە لای من:
گاڵتەجاڕیی، بوغزاندن، لەرزین، ترس، کوێرەوەریی و بەدیی

نەفیکراو، وەک خۆر، بۆ زیندانێکی قوتبی.
گیانم ڕەق دەبێت بۆ ناو پارچە سەهۆڵێکی سوور.

من هەڵئەلەرزم و گوێ ئەگرم بۆ هەر شکانی درەختێ و شەقە لێهەستانی:
سەداکان ناخۆشن وەک دەهۆڵی جەلادەکان.
مێشکم وەک بورجێک بە هێواشی تەسلیم ئەبێ
بۆ فوپیاکردنی دڵڕەقی لێدانی تۆپبارانکردن.

وام لا دیارە، لاردەبێتەوە بە لای ئەو ترسانەدا، کە کەسێک
بزمار ئەدا لە کفنێک بەپەلە لە جێیەک.
بۆ کێ؟ دوێنێ هاوین بوو؛ ئێستا پاییز.
سەدای کۆچ بەردەوام دەنگئەداتەوە لەناو هەواکە

## هێور

ئارام بگرە، ئای ئەی خەم، چەسپاو بە.
تۆ داوای شەوت کرد: ئەو داهات، ئەو لێرەیە.
کەشێکی سێبەراوی باڵی بەسەر گردەکەدا کێشاوە،
بۆ هەندێ پیاو ئاشتی ئەهێنێ، بۆ هەندێکی تر بایەخدان.
لە کاتێکدا زۆرن مرۆڤە بەدەکان
دەچن بۆ دەسخستنی پەشیمانی، لە گەمەی تامەزرۆی زەلیلی،
لەژێر قامچی شادی، ئەشکەنجەدەر، کێ
بێ بەزەییە، خەمناکە، دێت، لە دوورەوە:
دەستم دەرێ، بیبنە، کە ساڵانی لەدەستچوو
خۆشۆڕکەوە لە باڵکۆنی ناو جلوبەرگی کۆنەباویان
کە پەشیمانبوونەوە، زەردەخەنە، شەپۆل ئەدەن لە قوڵاییەکانی ئاویی
لە بنەوە هەندێ ڕێرەو هەن، ڕووناکی ئەمرێ
ئەخەوێ و وەک کفنێکی درێژ لە ڕۆژهەڵاتەوە ڕاکێشراو،
گوێگرە، ئەزیز، گوێ لە شاڵاوی نەرمی شەو بگرە

چارلس بۆدلێر دادەنرێت بە بەناوبانگترین شاعیرانی سەدەی نۆزدەی فەرەنسا و گەورەترین کاریگەریی لەسەر شاعیرانی رۆژاوا و مۆدێرن هەبووە، لەگەڵ رامبۆدا بابەتە شیعرییەکانیان لەمەڕ ژیانی هاوچەرخ و رووە تاریکەکانی دواوە، لە ساڵی ١٨٢١ لە پاریس لەدایک بوو، لە ١٨٤٠ بەنیازی خوێندنی یاسا چووە زانکۆ، بەڵام هەرگیز تەواوی نەکرد، لە ١٨٤١ نێردرا بۆ هیند، بەڵام لە ١٨٤٢ گەڕایەوە، گرنگترین تەوەرەی بەرهەمەکانی (سروشت دانابڕدرێت لەجوانی و خراپی). یەکەم رۆمانی لە ١٨٤٧ نووسی، هەروەها رەخنەشی نووسیوە، لە ساڵی ١٨٥٢-١٨٦٥ بەرهەمەکانی ئێدگار ئەلان پۆی پەرچڤە کردن، لە گرنگترین شاکارەکانی:

(گوڵەبەدەکان-The Flowers of evil)

لە ١٨٦٧/٨/٣١ کۆچی دوایی کرد.

ئەم پەرتووکانە لە گرنگترین سەرچاوە باشەکانن دەربارەی بۆدلێر:

Baudelaire the Critic by Margaret Gilman (1943)؛

Baudelaire by Enid Starkie (1957)؛

Baudelaire by Claude Pichois and Jean Ziegler (1989)؛

Charles Baudelaire Revisited by Lois BoeHyslop (1992)؛

Baudelaire by Joanna Richardson (1994).

**سەرچاوە:**

-www.poemhunter.com/charles-baudelaire

-famouspoetsandpoems.com/poets/charles_baudelaire/biography

# موزیک لە سەردەمی (کلاسیک)دا



● فەرمان عەلی نوری

کلاسیزم: بزووتنەوەیەکی هونەری و ویژەییە، کە پێشنیاری لاساییکردنەوەی مۆدێلەکانی گریک و لاتین دەکات.

لە مێژووی موزیکدا ئەو ماوەیەی دەکەوێتە نێوان کۆتایی سەردەمی باڕۆک و سەرەتای دەستپێکردنی سەردەمی ڕۆمانتیکەوە، پێی دەوترێت کلاسیک، هەتا ڕادەیەک ساڵی دەستپێکردنی (١٧٦٠)ەو کۆتاییەکەی دەروبەری ١٨٣٠ دەگرێتەوە، پایتەختی ئەم بزووتنەوەیەش شاری ڤییەننا بوو، کە بوو بووە بنکەیەکی پۆلایین بۆ ئەو شەپۆلە هونەرییانەی موزیکزانەکانی ئیتاڵی و ئەڵمانی و فەڕەنسی هێنابوویانە شارەکەوە و سەرچاوەیەکی پتەویان بۆ دابینکردبوو، کە دەوڵەمەندیان کردبوو بە لۆژیکی ئەڵمانی و فەڕەنسی و میلۆدییە نەرم و خۆش ئاوەزەکانی ئیتاڵی.

هەر لە سەرەتای سەدەی هەژدەیەمەوە جموجۆڵێکی بیری و فەلسەفی لە هەموو بەشەکانی زانیندا تێڕوانین و بۆچوون و شێوەی بیرکردنەوەی کۆمەڵگەی سەدەی نوێ دەگۆڕن، هەلومەرجێکی وا دەخوڵقێنن کە خەڵک بە چاوێکی تری ڕەخنەگرانەوە بڕواننە ئامانجەکانیان، خۆی لە خۆیدا بزووتنەوەیەک بوو بۆ جیاکردنەوەی جیاوازی بۆچوون و دەربڕین لەنێوان کۆن و نوێدا، لەنێوان

نەریتی میللی و پێشکەوتنی زانستدا، یان لەنێوان هەست و هۆش و مێشکدا.

لە نیوەی دووەمی ئەم سەدەیەوە کەسانی وەکو "کانت" و "گۆتە" بە شاکارەکانیان هێزیان دەدا بە مێشکی خەڵک و توانایان دەخستنە گەڕ و هاندەرێکی بەڵگە نەویست بوون بۆ پێشخستنی کۆمەڵگە، لەسەر پرنسیپی پیرۆزی ئەرکەکانمان لەدایک نابن لە ئاستی چینایەتیمانەوە، یان لە دەسەڵاتی ئاینییەوە، بەڵکو لە ئازادیی مرۆڤ خۆیەوە پەیدا دەبن، چونکە مرۆڤ خۆی دەبێت ئازاد بێت، ئەم تەوژمە فەلسەفییانە بە تەواوەتی لەناو رۆشنبیراندا پەخش و بڵاوبوونەوە و لە هەموو زانکۆکانی جیهاندا دەخوێندران، ئەمە بوو ئامۆژگارییەکانی "کانت" کە دەیگەیاند بە مرۆڤایەتی، زیاتر وەک بیناسازێکی یاساکانی ویژدانی.

لە یەکێک لەو نامانەی بیتهۆڤن بۆ (گۆتە)ی ناردووە دەنووسێت "شێوەی نووسینت ئیلهامم پێ دەبەخشێت و وزەم دەداتێ بۆ نووسینی موزیکەکانم" بەگشتی رۆشنبیران بەم شێوەیە بەرهەمی ئەم نووسەرەیان دەنرخاند، لەلایەکی ترەوە بنچینە و رێبازەکانی شۆڕشی فەرەنسی دنیای هەژاندبوو، لەژێر دروشمی ئازادی، یەکسانی، برادەرایەتیدا داوای گەڕانەوەی دەسەڵاتیان دەکرد بۆ میللەت، رۆڵ و گرنگی ئەم شۆڕشە کاریگەرییەکی گەورەی هەبووە لەسەر کۆمەڵگەی ئەو سەردەمە، لە لایەکی ترەوە، هەموو ئەورووپا گلابوو لە شەڕەکانی ناپلیۆنەوە و لە ئەنجامی ئەم شەڕانەدا بە جارێک شیرازەی کۆمەڵی ترازاندبوو، هەرچەندە درەنگتر چەند کەسانێکی وەکو ناپلیۆن رێڕەوی شۆڕشەکە بە هەڵەدا دەبەن و ئەنجامەکەی دەبێتە کاولبوون و خوێنڕشتنێکی زۆر.

ئەڵمانیای ئەو کاتانە دابەش بووبوو بەسەر میرنشین و دەوڵەتی بچووک بچووکدا، لەبەرئەوە ئەو گۆڕنکارییە قوڵانەی خەریکی هێنانەدی جیهانێکی نوێ بوو پێکبهێنرێت لای ئەڵمانییەکان زیاتر لە میانەیەکی رۆشنبیری و فەلسەفیدا گەشەی دەکرد، بەڵام لەلای فەرەنسییەکان لە چوارچێوەیەکی رامیاریدا پەلوپۆی دەهاویشت، هەروەکو چۆن لە ئینگلتەرا گەشەکردن زیاتر لە بواری ئابوورییدا بوو.

لە ٢٠ی مانگی نۆی ساڵی ١٧٩٢دا کاتێک شەڕی ڤالمی valmy هەڵدەگیرسێت لەنێوان سوپا شۆڕشگێڕ و کۆمارییەکەی فەرەنسادا دژ بە هێزی هاوبەشی نەمسایی و رووسی، ئەنجامەکەی بە سەرکەوتنی شۆڕشگێڕەکان تەواو دەبێت، لە راستیدا ئەم شەڕە سەرکەوتنی خەڵکە هەژار و ساکارەکە بوو بەسەر سوپای راهێنراوی دار دەستی مەملەکەتی شاهانەی نەمسایدا، دەسەڵاتدارانی کۆنی ئەورووپا، ئەم سەرکەوتنە لە هەموو لایەکەوە زۆر بە شانازییەوە پێشوازی

دەکرێت، (گۆتە)ی بلیمەت لە نزیکەوە ئەم شەڕەی بینیوە و بەم چەشنە دێتە قسە دەربارەی ((من پێتان دەڵێم، لە ئەمڕۆوە و لەم جێگەیەوە سەدەیەکی نوێ دەست پێدەکات لە مێژووی جیهاندا)).

فەڕەنسا ڕۆڵ و گرنگییەکی گەورەی سیاسی دەبینی لە سەرانسەری ئەوروپادا و بووبووە وێردی سەر زاری هەموو خەڵک و بە پەرۆشەوە سەیری ئاکامەکانی شۆڕشەکەی دەکرا، بەڵام پاشان ئیتر هێدی هێدی شۆڕشەکە بووە ئامرازێکی دامرکێنەر و داپڵۆسێنەر، ئەمە بووە شکستییەکی گەورە لەناو ئەو کەسانەدا کە چاوەڕێی زۆر شتیان دەکرد، لەم شۆڕشەوە هەموو هیوایەکیان پێی هەبووە، بەڵام بیر و فەلسەفەکانی لەسەر ماف و نرخاندنی مرۆڤ و ڕاپەڕین دژ بە چەوسێنەر تازە چەسپابوون لە مێشکی خەڵکدا و سڕینەوەیان مەحاڵ بوو، ئەم تێوریانە بە باشی ڕەنگیان دابووەوە لە هەموو لایەنەکانی ژیاندا و هونەر و موزیکیش بووبوونە باشترین ئاوێنە و مەشخەڵهەڵگری ئەم بیرە نوێیانە.

پێشکەوتنی پیشەسازی و گەورەبوونی بازاڕی جیهانی و مۆنۆپۆلکردنی بازاڕەکان بوونە هۆی ململانێ لەنێوان وڵاتەکانی ئەوروپا، بەتایبەتی لەنێوان ئینگلتەرا و فەڕەنسادا، ئەم دوو وڵاتە لە زۆر ڕووەوە لە یەکتری دەچوون، بەڵام لەسەر دەسەڵاتی ئابووری هەمیشە دژ بە یەکتر بوون، بۆ ئەم کێشانە لەسەر زەوی ئەمریکا و ئۆقیانووسی هیندیش ڕووبەڕووی یەکتری دەبنەوە، لەو کاتانەدا فەڕەنسا لە بنەڕەتەوە شڵەژا بوو، چونکە خراپ حوکمڕانی دەکرا لەلایەن "لۆیسی پانزە"وە، بەڵام ژمارەی دانیشتووانی فەڕەنسا سێ جار زیاتر بووە لەوەی ئینگلتەرا، وایلێهاتووە زمانی فەڕەنسی لە هەموو کۆشکەکانی ئەوروپادا قسەی پێ دەکرا و پاریس بووبووە بنکەیەکی کولتوور، لە ڕێگەی ئەم جموجوڵە هونەرییانەوە زۆر خەڵکی خستبووە کارکردنەوە- گەلێک لە هونەرمەندان بۆ ئەم مەبەستە ڕوویان دەکردە ئەم شارە، دوای ئەوە ئەکادیمی شاهانەی موزیکیان لە شارەکە دامەزراند و گەلێک شانۆ دروستکران بۆ چالاکییە هونەرییەکان، بنکە چاپەمەنییەکان بەشێوەیەکی فراوانتر لە جاران کەوتنە چاپکردن و بڵاوکردنەوەی بەرهەمە نووسراوەکان، بەم شێوەیە خەڵک لە نزیکەوە کەوتنە ناسینی هونەرمەندان و تێگەیشتن لە مەبەستەکانیان، بۆ پەرەپێدانی موزیک و وەڵامدانەوەی داخوازی خەڵکەکە ئەکادیمیایەکی تری موزیک دەکەنەوە لە شاری لیۆن loyn هەروەها بناغەی پەیمانگایەکی هونەری لە ساڵی ١٧٥٢دا لە شاری بۆردۆ Bordeaux دادەمەزرێنن، لە بەرامبەر ئەم دەسەڵاتە هونەرییەی فەڕەنسادا، ئینگلتەراش دەکەوێتە خۆی بۆ دامەزراندنی بنکە هونەرییەکانی، بێجگە لە لەندەن کە شارێکی زۆر گرنگی هونەر و موزیک

بووە، چونکە جموجۆڵی تەوژمێکی زانستی و ویژەیی گرنگی تیادا بووە بۆ برەودان بە شارستانییەت و پێشخستنی کۆمەڵگە، هەروەها لە شاری لیڤەرپوڵ و مانجستەریش Liverpool Manchester گەلێک شانۆ و قەتابخانەی موزیک دادەمەزرێنن.

شاری میرنشینە بچووکەکانی ئەڵمانیاش دەستێکی باڵایان هەبووە لە بناغە دانان و بەگەڕخستنی موزیکی سەردەمەکەدا، بەتایبەتی ئەو بەشەی لەژێر دەستی فێدێریکۆی دووەمدا بووە (پرۆس)، کە زیاتر لە پێشبڕکێدا بوون بەرامبەر ئەو ناوچانەی لەژێر فەرمانڕەوایی مەرییە تێریزەی شاژنی نەمسادا بوو، ئەم پاشایە کابرایەکی زۆر بەتوانا و بە دەسەڵات و هونەردۆست بووە، خۆشی فلوت ژەنێکی خراپ نەبووە، لە پاشاندا ئەو ناوچانەی لەژێر رکێفیدا بوون لە سایەی ئەمەوە ئاسایش و پێشکەوتنێکی باش بەدەست دەهێنن، شارەکانی ئەڵمانیای گەورە بە گشتی کە رۆڵێکی گرنگیان هەبووە لەم مەیدانەدا، گرنگترینیان شارەکانی (بەرلین، مەنهایم، لیپزیگ، لوبێک، بۆن، درێسدن،... هتد) پێشچاو دەخرێن.

وڵاتێکی تر کە گرنگییەکی زۆر گەورەی هەبووە لە بناغە دانانی جوگرافیای موزیکی ئەوروپادا، ئیتاڵیا بوو، دادەنرا بە "نموونەی زانکۆیەکی موزیک" وەکو چۆن شوتز schutz لە ساڵی ١٦٤٨دا پێی دەوت، ئەو وڵاتەی کە بەتایبەتی لە دوای شەڕی ٣٠ ساڵەی (١٦١٨-١٦٤٨)، کە هەموو ئەوروپای گرتبووەوە، بوو بووە بنکەیەکی گۆرانی و موزیک، ئەم دەوڵەمەندییەی وایکردبوو گەلێک موزیکژانی شارەزا و کارامە رووبکەنە ئەم وڵاتەوە و گەلێک موزیکژانی ئیتاڵیش رووبکەنە وڵاتەکانی تری ئەوروپا بۆ کارکردن لە کۆشکی میرەکاندا، ئەم نیشتمانی موزیکە بەتایبەتی لە ئۆپێرا و موزیک بۆ ئامێرەکاندا رێنیشاندەر و رابەر بوون بۆ وڵاتەکانی تر.

شاری ناپۆلی بنکەیەکی درەوشاوە و هەمیشە لە لوتکەدا بووە، ئەم شارە لانەی ئۆپێرا بەتایبەتی بەهۆی ئەو قوتابخانە موزیکییانەی کە تیایدا بووە و بەهۆی شانۆی "شان کارلۆ"وە san carlo کە لەسەر ئاستی جیهانیدا ناسراو و هەمیشە چالاکی تیادا بووە، هەروەها رۆمای پایتەخت هەر لەژێر دەسەڵاتی بێنێدێتی چواردەیەمی benedetto xiv زیرەک و لێهاتووەوە بووبووە بنکەیەکی کولتووری ئەوروپی، بەتایبەتی لە موزیکی دینیدا، لە کەپێللەی "جولی"و "سیستینە"giulia ,sestina لە "سان پیێترۆ" san pietro کە بنکەی مەسیحییەتی کاتۆلیکەکانی دنیاییەوە، هەورەها کڵێسەی "سانتە ماری یە ماجۆری" santa maria maggiore گەلێک بەرهەمی دینیان تێدا پێشکەش دەکرا و دەپارێزرا، شاری بۆلۆنیا bologna خۆی لە خۆیدا هەمیشە جووڵە و ژیانەوەیەکی

رۆشنبیری تێدا بووە، هەندێک میرزادە لە شارەکەدا هەڵدەستن بە بڕیاردانی دروستکردنی شانۆیەکی نوێ لەژێر چاودێری و بە ناوی شارەوانی شارەکەوە ناو دەنرێت "شانۆی شارەوانی" teatro comunale کە لە ساڵی ١٧٦٣دا ساڵی کردنەوە و پیرۆزکردنی بوو، هەروەها یەکێک لە باشترین تیۆرزانی موزیکی ئەو سەردەمەی ئەوروپای تێدا دەژیا لەم شارەدا، ئەویش قەشە مارتینی بوو، ناوچەی "تۆسکانە"ش یەکێک بوو لە ناوچە گەشەدارەکانی کولتووری سەردەمەکە، بەتایبەتی لە شاری فلۆرەنسادا. لە ڕێی سەمفۆنییەکانی "سەمەر تینی" شەوە شاری میلانۆ بنکەیەکی گەورەی موزیکی ئامێرەکان بووە، ئەم شارە لە ڕێی ڤێنێتسیاش بنکەیەکی درەوشاوەی موزیکی شانۆی بوو، شارەکە خاوەنی چوار قوتابخانەی موزیک بووە، کە پێیان دەوترا کۆنسێرڤەتۆریۆ conservatorio، هەموو فۆرمەکانی موزیک لەم شارەدا ناسراوبوون و جێگەی خۆیان کردبووەوە، جموجۆڵی هونەری شارەکە بە بەردەوامی لە بەرفراوانیدا بووە، بەتایبەتی چالاکییەکانی ناو کڵێسەی سان مارکۆ san marco، هەروەها ئەو کۆمەڵە شانۆ بچووکانەی کە شارەکەی پێ ڕازابووەوە و پێوە ناسراوبوو، بە بەردەوامی تیایدا دەنوێنرا.

لەسەروو ئەم جموجۆڵ و دووبەرەکییانەی لەئارادا بوون لە ئەوروپا بۆ هەڵکردنی مەشخەڵی هونەر و نوێنەرایەتیکردنی بەمەبەستی چەسپاندنی دەسەڵاتیان لەم بوارەشدا، بۆ ئەوەی کە بتوانن لە ڕێگەی هونەریشەوە دەست بگرن بەسەر مێشکی خەڵک و شێوەی بیرکردنەوەی کولتووری میللەتانی تردا و سوودلێوەرگرتنیان، هەروەها سەرچاوەیەکی ئابووریش بوو بۆیان، چونکە لە ڕێگەی فرۆشتنی ئەم بەرهەمانەوە قازانجێکی زۆریان دەکرد.

بەشێوەیەکی سەرەکی، هەر شاری ڤییەننا بە گرنگترین بنکەی موزیکی ئەم سەردەمە دەمێنێتەوە، یەکێک لە هۆکارەکانی ئەم جێگیربوونەش دەگەڕێتەوە بۆ شوێنی جوگرافی وڵاتەکە، لەبەر ئەوەی سنووری بەستراوە بە شەش وڵاتەوە و هەمیشە سەرەڕێی هاتوچۆ بووە لە بەینی ئەم وڵاتانەدا، لەدوای ئەو شەڕانەی لە ئەوروپا روویان دا، خەڵکێکی زۆر لە وڵاتی خۆیانەوە کەوتنە کۆچکردن بۆ ئەم شارە، بەتایبەتی لە پراگ و میرنیشنە فەرمانڕەواکانی ئەڵمانیاوە بە مەبەستی کارکردن و پاشان مانەوەیان بە یەکجارەکی لەوێ، لەناو ئەمانەدا کۆمەڵێک نووسەر و موزیکزانیش روویان تێکرد، لەبەرئەوە بە بەردەوامی چالاکی هونەری هەبووە لە شارەکەدا، دوای ئەوە هەر لە کۆنەوە ڤییەننا پایتەختی ئیمپراتۆرییەتێکی گەورەی وڵاتی نەمسا بووە کە لە مێژووی سیاسی و ئابووری ئەوروپادا دەسەڵات و رۆڵێکی تایبەتی هەبووە، هەر لە سەردەمی

ماریا تیریزاوه(Maria Theresa taller) لەم وڵاتەدا گرنگییەکی زۆردراوە بە هونەر و ویژە، بەتایبەتی بە موزیک و سەما، ئەم شاژنە خۆی زۆر ئارەزووی لە موزیک و ئۆپێرای ئیتاڵی دەکرد، پاش مردنیشی کاتێک جوزێپێی دووەمی کوڕە گەورەی جێگەی دەگرێتەوە، بەهەمان شێوە بەردەوام دەبێت بەم گرنگیدانە، لەڕاستیدا هەموو بنەماڵە ئەریستۆکراتییەکانی ڤییەننا گرنگییەکی زۆریان دەدا بە موزیک و سەما، لە کۆشکەکانیاندا هەمیشە ئاهەنگی تێدا دەگێڕا و کۆنسێرتی تێدا پێشکەشکراوە، هەتا ئەو رادەیەی بنەماڵە دەست رۆیشتووەکانیان ئۆرکێسترای تایبەتی خۆیان هەبووە، بۆ ئەم مەبەستەش دەهاتن باشترین موزیکنووسی ئەو کاتە و هەموو بەرپرسیارییەکی موزیکنووسی ئەو کاتەیان دەگرتە خۆیان و هەموو بەرپرسیارییەکی موزیکیان دەخستە ئەستۆی، ئەوانیش دەبوایە بە بەردەوامی موزیکی نوێیان بنووسیایە لە هەموو فۆرم و شێوازەکانی کە لەو سەردەمەدا باویان هەبووە و لەسەر چێژی خاوەن ماڵەکە بوایە، لە پاشاندا گەڕان بەدوای دەستنووس و کتێبە کۆنەکاندا بۆ پێکهێنانی کتێبخانەیەکی موزیک بۆ کۆشک لە هەموو بەرهەمە گرنگ و ناودارەکانی ئەو رۆژگارە و سەدەکانی پێشوو. هەروەها بەڕێوەبردنی ئۆرکێستراکە و جێبەجێکردنی پێداویستییەکانیان و بەدەستهێنان و کڕینی ئامێرەکانی موزیک بۆیان، لە پاشاندا لە هەموو بۆنە و جەژنەکاندا دەبوایە بەرنامەیان ئامادە بکردایە، یان هەرکاتێک میوانێکی گرنگ بهاتایەتە ناو کۆشک و خاوەن ماڵ ئارەزووی بکردایە، شەوێکی موزیکیان پێشکەش بکات، دەبوایە ئۆرکێستراکە هەموو کاتێک ئامادەبووایە، یان بەرپرسیاری موزیکی کۆشک شەوەکەی برازانایەتەوە بە پێشکەشکردنی چەند بەرهەمێک لەسەر ئامێری پیانۆ Piano، واتە هەمیشە دەبوایە لەسەر داوای خاوەنکارەکەیان بجوڵێنەوە و بەهیچ شێوەیەک لە فەرمانی ئەو دەرنەچن، چونکە ئەم هونەرمەندانەش هەروەکو خزمەتکارێکی تری ناو کۆشک سەیر دەکران.

موزیکنووسی مووچەخۆر نەیدەتوانی هیچ بەرهەمێکی بڵاوبکاتەوە، بەبێ ئاگاداری و رازیبوونی خاوەن کارەکەی، خاوەندارێتی بەرهەمەکەش بۆ نووسەر نەبوون، بەڵکو بۆ خاوەن ماڵەکە بووە، ئیتر چارەنووسی ئەو موزیکە بەدەست ئەوانەوە دەمایەوە، یان خاوەن ماڵ ئارەزووی لە موزیکێک نەبوایە نووسەر بۆی نەبووە پێشکەشی بکات و بڵاوی بکاتەوە، نموونەی ئەم رووداوانە زۆرن لە مێژووی موزیکی سەردەمەکەدا وەکو ئەو دەمەقاڵێیەی نێوان یۆمێللی موزیکنووس و خاوەن کارەکەی کارلۆ ئیوجینیۆی carlo eugenio ناوچەی "ویورتێمبێرگ"ی wurtemberg نزیک شاری شتودگاردەوە لە ئەڵمانیا، کە بەرهەڵستی ئەوەی لێدەکرد هەتا کۆپییەکی بەرهەمەکانی خۆشی لابێت،

موزیکزانە مووچەخۆرەکانی سەر بەم کۆشکانە بۆیان نەبوو لەسەر داوای لایەنێکی تر، یان کەسێکی تر موزیک بنووسن، بەبێ پرسی ئاغاکەیان وەکو ئەو کاتەی هایدن کە دەیەویت بەرهەمێک بنووسێت بۆ لایەنێک لە پاریس، یان کاتێک "بۆککێرینی" Boccherini لە مەدریدەوە بەرهەمێکی دەنێرێت بۆ شای پروسیا چۆن تووشی گێرمە و کێشە دەبێت لەسەری، لە ساڵی ١٧١٧دا یۆهان سباستیان باخ بۆ چەند رۆژێک دەخرێتە زیندانەوە، هەر لەبەر ئەوەی پێ دادەگرێت بۆ بەدەستهێنانی داواکەی، هەر لەسەر ئەم کێشانە "گراوپنەر" graupner لە ساڵی ١٧٢١ پاشگەزی لەو کارە دەکاتەوە کە لە شاری لیپزیگی ئەڵمانیاوە پێشنیاری بۆ دەکەن، بێگومان ئەم شتانە روویان دەدا، لە کاتێکدا کە هیچ یاسایەک نەبوو مافی هونەرمەند بپارێزێت، بۆیە خاوەن کارەکانیش بە ئارەزووی خۆیان بەکاریان دەهێنان بۆ مەبەستی خۆیان، بەم جۆرە بۆی هەبووە هەڵسوکەوتەکان لە خاوەن کارێکەوە بۆ یەکێکی تر بگۆڕدرێت، یان لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر بەپێی نەریتی ئەو شوێنە و تێگەیشتنیان بەرامبەر بە هونەر، لەگەڵ ئەمانەشدا کارێک بوو بەدەست هەموو هونەرمەندێک نەدەکەوت، لەو رۆژگارانەدا ئەوەی ئەم جێگەیەی بەدەستدەهێنا، بەختەوەر بوو، چونکە ئەم کۆشکانە دڵنیاییەک و جێگیرییەک بوون بۆ ئەم هونەرمەندانە و ژیانیان مسۆگەر دەکردن، لەبەر ئەوە کاتەکانیان تەرخان دەکرد تەنیا بۆ کارکردن لە بوارەکەی خۆیاندا بەبێ ئەوەی بیر لە گیروگرفتی ئابووری بکەنەوە، بەڵام ئەوە بوو هیچ سەربەستییەکیان نەبووە، نموونەی هونەرمەندی سەربەست لە نیوەی دووەمی ئەم سەدەیەوە بەدی دەکرێت.

موڵکایەتیکردن بەسەر هونەرمەندانددا لەلایەن خاوەن کارەکانیانەوە وردە وردە بەرەو کەمبوونەوە دەڕۆیشت، بەتایبەتی لەدوای ئەو شەڕانەی لە ئەورووپادا هەڵدەگیرسێن، خاوەن کارەکان لەپاش ئەم شەڕانە لە توانای ئەوەدا نەمابوون خەرجی هونەرمەندان دابین بکەن، چونکە نەیاندەتوانی وەکو جاران سەربەستانە پارە خەرج بکەن، لە ئەنجامی دابەزینی نرخی پارەی نەمسای، ئابووری ئەوانیش شڵەقابوو، لەبەر ئەوە دەبوایە کەمێک نەرمتر لە جاران هەڵسوکەوتیان بەرامبەر کارگێڕەکانیان بکردایە و نەیان دەتوانی بە شێوەی جاران فەرمانیان بەسەردا بسەپێنن، لە ئەنجامی ئەو گۆڕانکارییانەی روو دەدەن کۆمەڵیش بیروباوەڕی دەگۆڕدرێت بەرامبەر هونەر و هونەرمەندن، هەروەها پێشکەوتنی پیشەسازی و فراوانبوونی رێگە خۆش دەکەن بۆ خاوەن موڵک و بۆرگێزییەکانیش کە چەمکێکی دەسەڵات بەدەست بهێنن و خۆیان تێکەڵی ئەو خێزانە ئەریستۆکراتیانە بکەن ئەوانەی کە هەر لە کۆنەوە بە میراتی دەسەڵاتیان

بۆ مابووەوە، لەگەڵ دەردا و پاش تەقینەوەی شۆڕشی پیشەسازی ئەو بە جارێک سەرمایەدارەکان دەسەڵاتیان جێگیر دەکەن و بگرە شوێن پێ بەوانی تریش لەق دەکەن. لەپاشاندا بە کەمبوونەوەی دەسەڵاتی ئەرەستۆکراتییەکان و زیادبوونی دەسەڵاتی بۆرگێزییەکان کەمێک ریفۆڕمیش دەکرێت، ئەم شەپۆلی ریفۆڕمانە بەگشتی هونەریش دەگرێتەوە و بارەکە لەبارتر دەکەن بۆ هونەرمەندان.

موزیکزانەکان روو دەکەنە شارە گرنگەکانی وەکو پاریس و لەندەن و ڤییەننا، چونکە لەم شارانەدا کارەکانیان ئاسانتر و خێراتر رادەپەڕاند، گەورە بوون و گەشەکردنی بنکە چاپەمەنییەکان و زیاتر گرنگیدانیان بۆ بڵاوکردنەوەی بەرهەمە موزیکییەکان ئەوەندەی تر موزیکی سەردەمەکەی چەسپاند.

ئەمە کورتەباسێکی گشتی باری رامیاری و ئابووری و کۆمەڵایەتی ئەو کاتانەی ئەوروپا بوو، لەپاشاندا با واز لەم شتانە بهێنین و کەمێک لایەنێکی تری تاوتوێ بکەینەوە کە گرنگییەکی گەورەی هەبووە لە داڕشتنی موزیکی سەردەمەکەدا، ئەویش دروستکردنی ئامێری پیانۆ Piano بوو. ئەم ئامێرە وای لێهاتبوو وەکو نیشانەی دەوڵەمەندی و خۆشی و کامەرانی هەموو خێزانێکی دەسترۆیشتوو پیانۆیەکیان هەبووە لەماڵەکەیاندا، کە هەر وەکو شتێکی باوی سەردەمەکە ئەندامانی خێزانەکە هەوڵی فێربوونیان داوە، لەگەڵ دروستکردن و پەرەپێدانی ئەم ئامێرەدا موزیکیش گەشە دەکات و بەرگێکی تر دەپۆشێت، هەموو ئەو توانایەی کە کاتی خۆی موزیکنووسەکان دابویان بە ئامێری چێمبەلۆ بۆ کارکردن لەسەری، ئێستا دەیدەنە پیانۆ Piano، لەپاشاندا کەوتنە داڕشتنی موزیکەکانیان لەسەری و هەر بە زوویی رۆڵێکی گەورەی بینی بۆ بەخشینی تاموچێژێکی نوێ، کە رێگەی بۆ موزیکنووسەکان خۆشکرد، بە جۆرێکی تر بیرەکانیان داڕێژن، لەگەڵ جێگیربوونی ئەم ئامێرەدا ئیتر بەجارێک ئامێری چێمبەلۆیان پشتگوێخست و ئەو گرنگییەی جارانی نەما، چونکە لە پێشدا و بەتایبەتی لە سەردەمی بارۆکدا وەک ئامێرێکی بنەڕەتی رۆڵێکی سەرەکی هەبووە چ وەک سۆلیست، یان بە هاوبەشی پێکردنی بۆ موزیکی پێکەوەیی (ژەندنی بە کۆمەڵ)، لەمەی دووەمیاندا هەمیشە لەگەڵ ئامێری چەلۆ Cello-دا ئەرکی بەشی هارمۆنی (گونجاندنی دەنگیی)یان پێ دەسپاردن، لە موزیکی سەردەمی بارۆکدا دەهاتن دەور و خولی میلۆدییەکەیان دەڕازاندەوە بە بەشێکی هارمۆنی کە پێیان دەوت "باسی هەمیشەی" basso continuo، ئەو رۆڵەی کە دابوویان بەم دوو ئامێرە، ئەوە بوو کە هەر لە سەرەتای موزیکەکەوە هەتا کۆتاییەکەی بەشی هارمۆنییەکەیان لێداوە بەبێ وەستان، لەپاشاندا بە لابردنی ئەم شێوە کارکردنە خۆی لە خۆیدا گۆڕانکارییەکی گەورەی هێنا بەسەر شێوە و چێژی موزیکدا، وەکو

بڵێین رزگاری کرد لەو چوارچێوە تەسکەی کە باسی هەمیشەیی بەخشیبووی بە مۆزیکەکە، لەمەوە پلە بە پلە دەگەینە هەوڵدان بۆ ئاسانکردنی داڕشتنی موزیکی کلاسیک و دوورکەوتنەوە لەو فەلسەفەی کارکردنەی سەردەمی بارۆک کە مۆزیکەکەیان دابەش دەکرد بە دوو بەشەوە، بەشی یەکەمی میلۆدییەکەی بوو، دەوری گیرابوو و پاڵپشتی دەکرا، بەشی دووەم کە بەشی باسی هەمیشەیی بوو، بۆیە لە ئۆرکێسترادا چیمبەلۆ تەنیا لایەنی هارمۆنی موزیکەکەی پێ پڕ دەکرایەوە، بەڵام لە داڕشتنی موزیکی کلاسیکیدا هەموو هێڵێک سەربەستی و گرنگی خۆی وەردەگرێت، لەنێوان هێڵەکاندا یان دەتوانین بڵێین لەنێوان دابەشکردنی گرووپی ئامێرەکاندا بەشێوەیەک موزیکەکە داڕێژراوە دیالۆگێک بەیەکیانەوە گرێدەدات، لەم سەردەمەدا میلۆدی و هارمۆنی هەمووی بە یەک چاو سەیر دەکرێن و پەیوەندییەکی بەتین بەیەکیانەوە دەبەستێتەوە، هەر هێڵێکی نووسراو لەگەڵ هێڵێکی تردا هەمیشە لە گفتوگۆدا پێکەوە. بەم جۆرە ئەو فۆڕمی موزیکانەی لە قۆناغی سەدەکانی پێشوودا دروست ببوون و لەبرەودا بوون وەکو (سۆناتە، سیمفۆنی، کۆنشرتۆ، چوارینە) ئەگەر بەراورد بکەین، دەبینین لەم سەردەمەدا فۆڕمەکانیان جێگیرییەک لەناویاندا هەیە و بەسەر چەند یاسایەکدا دابەش دەبن و هەموو تێم و رستە میلۆدیەکی نوێ لە بەرهەمەکەدا قورسایی خۆی هەیە و زۆر بە ئاسانی دەستنیشان دەکرێن.



کۆمەڵێک ژەنیار (فۆڕمی چوارینە دەژەنن)

بەشێوەیەکی گشتی لەسەر پلە سەرەکییەکانی پەیژەی موزیک هارمۆنیان دادەڕشت بەبێ قورسکردنی رستە میلۆدییەکان بۆ رازاندنەوەیان بە وردە دەنگ، وەکو باو بووە لە سەردەمی بارۆکدا. ئامانجی ئەم رێبازەی موزیکی کلاسیک هەر بۆ ئاسانکردنی موزیکەکە بووە بۆئەوەی خەڵکە ئاساییەکەش لەم موزیکانە چێژ وەربگرن، نەک بە تەنیا لە بنەماڵە دەستڕۆیشتووەکاندا بمێنێتەوە کە بەپێی ئەو هەلومەرجانەی کە بۆیان لوابوو وەک نەریتێک بۆیان مابووەوە، زیاتر لە موزیک تێدەگەیشتن و زانیارییان دەربارەی هەبووە. ئەم رێبازەش ویستێکی تری کۆمەڵگەی ئەو سەردەمە بوو کە لەگەڵ گۆڕانکارییەکاندا دەگونجان، چونکە کۆمەڵگە لە قۆناغێکی تردا بوون و وریابوونەوە و بەشێوەیەکی جیاواز دەیانڕوانییە پێشکەوتنی ژیان و برەوپێدانی.

گەشەکردن و فراوانبوونی موزیک لە سەردەمی کلاسیکدا زیاتر بۆ موزیکی ئامێریی بووە. لەم سەردەمەدا زۆربەی ئامێرەکان لە بواری تەکنیکدا پێشکەوتنێکی لە رادەبەدەری بەدەست دەهێنن، خۆ ئەوە نەبێت پێشکەوتنەکە کەمتر بووبێت لە ئۆپێرادا (موزیکی شانۆیی) بەتایبەتی لە بینینی بەرهەمەکانی:

١- گلۆک
٢- کێروبینی
٣- مۆزارت...هتد

بەڵام موزیکی ئامێریی زیاتر رۆڵێکی گرنگی بەخۆوە دەگرێت، لە پاشاندا بێجگە لە گەشەکردنی تەکنیکی ئامێرەکان، زیادکردنی رۆڵی سۆلیست لەگەڵ ئۆرکێسترادا، بەتایبەتی نووسینی کۆنشرتۆی ڤایۆلین Violin، یان پیانۆ Piano لەگەڵ ئۆرکێسترادا Orchestra، بۆچوونێکی تری سەردەمەکە بوو. گەورەکردنی ئۆرکێسترا بە ئامێری نوێ و پتەوکردن و زیادکردنی ئامێرە کەوانەدارەکان (ڤایۆلین Violin، ڤایۆلا Viola، چەلۆ Cello، کۆنتراباس Contra Bass) و گرنگیدان بە ئامێرە هەواییەکان لەناو ئۆرکێسترادا رەنگێکی تر دەدەن بە موزیکی سەردەمەکە، لە پاشاندا بۆ دەربڕینی تام و چێژی جۆراوجۆر، گەلێک نیشانەی جیاواز پێکدەهێنن بۆ موزیکەکانیان ئەویش دوای ئەو بۆچوون و دەربڕینە ئازادانە بوون کە خۆیان حەشاردابوو لە دەروونی مرۆڤدا، ئەم ئازادیی دەربڕینە پاشان وردە وردە لە هەموو بوارەکانی ژیاندا بڵاو دەبنەوە و جێی خۆیان دەگرن. ئەمەبوو شێوەیەکی گشتی بارودۆخی گۆڕانکارییەکانی موزیکی سەردەمەکە.

لە پاشاندا مامۆستا بنچینەییەکانی موزیکی کلاسیک (هایدن و مۆزارت و

بیتهۆڤن) بوون، كە ئێستا بانگ دەكرێن بە كلاسیكی ڤییەننایيەكان، ئەمانە بە بەرهەمەكانیان باشترین ئاوێنە و نوێنەری ئەم ڕێبازانە بوون، چونكە بە جارێك شێوە و ناوەڕۆكی موزیكی، دەورێكیان چەسپاند و هەرسێكیان چمكێكی بەرەوپێش برد.

ئەو فۆرمانەی بەكاردەهێنران، پێشتریش هەبوون، بەڵام لەم سەردەمەوە لەسەر دەستی ئەم دانەرانە تەواو جێگەی خۆیان گرت و چەسپێنرا. ئەم كەڵە دانەرانە لەپاش ئەوەی كلتووری ئیتاڵی و ئەڵمانی و فەڕەنسی گەنجینەیەكی گەورەیان بۆ خۆیان پاشەكەوت كرد، بەدەست ڕەنگینی خۆیان و توانا گەورەكەیان موزیكی زۆر جوان و جۆراوجۆریان لێ بەرهەمهێنا و بەخشییان بە مرۆڤایەتی.

ئەگەر سەرنجێك بدەین لە تەمەنی (هایدن و مۆزارت) دەبینین جیاوازی (٢٤) ساڵ لە بەینیاندا هەیە، كەچی لەسەر ئاستی شێوەی كاركردنیان زۆر لەیەكەوە نزیكترن وەك لە (مۆزارت و بیتهۆڤن)، كە وەكو ئەوە وایە سەر بە دوو جیهانی زۆر دووربن لەیەكەوە، كەچی بەرواری لەدایكبوونیان تەنیا (١٤) ساڵ جیاوازی هەیە، ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هۆكارانەی كە گۆڕانكارییان خستبووە كۆمەڵگەی سەردەمەكەوە لەكاتی (بیتهۆڤن)دا، بۆیە بەرهەمەكانی ڕەنگدانەوە و تەقینەوەی ئەو بیرە ئازادانە بوون كە كۆمەڵگەی لە دیلێتی ڕزگار دەكرد و سەقڵی تایبەتی دەورێكیان پێوەیە، كە تیشكی ئازادی هەڵیدەسوڕاند، بەڵام دەتوانین بڵێین كە مۆزارت پردێك بوو لەنێوان جیهانی كۆن و نوێدا، یان لەنێوان (هایدن و بیتهۆڤن)دا، هەروەكو چۆن بیتهۆڤن پردێكە لەنێوان كلاسیك و سەردەمی ڕۆمانتیكدا، لەكاتی (بتهۆڤن)دا دانەر ڕۆڵێكی تری هەبووە لەناو كۆمەڵدا و تەنیا وەكو كارگێڕێكی بەردەستی خاوەن كارەكەی سەیر نەدەكرا، بەڵكو وەك كارمەندێكی سەربەست سەیر دەكرا، هەتا لە داڕشتنی بیرەكانیشیاندا ئازاد بوون.

لە تەمەنی بیستودوو ساڵیدا ئەو شارەی تیایدا لەدایكبووە بە یەكجاری بەجێدەهێڵێت و ڕوو دەكاتە ڤیەننا، هەر وەكو ئەو ڕۆژەی مۆزارت بڕیار دەدات سالیسبورگ بەجێدەهێڵێت و بۆ ئەوەی بچێتە ڤییەننا، بەڵام هەر لەو كاتانەی شاری (بۆن)ەوە یەكێك بوو لەو گەنجانەی بیروباوەڕی شۆڕشگێڕانەی هەبووە، كە فەرمانی كەسی قبوڵ نەدەكرد و هەر ئەو بەرهەمەی نووسیوە كە بە دڵی خۆی بووە، یەكەم موزیكزان بووە هەموو كۆتەكانی ئەو سەردەمەی شكاندووە و پەیڕەوی پێداویستییەكانی ڕۆژگاری نوێی كردووە، بۆچوونەكانی لەگەڵ بۆچوونی ڕۆشنبیران و گەنجە ریفۆڕمیستەكاندا بووە، بۆیە هەروەكو یاخی

بوون و دژایەتی سیستمی کۆن، گەنجە یاخیبووەکان بارۆکەی قژ فڕێ دەدەن، ئیتر هەر لە (بیتهۆڤن)ەوە موزیکزانەکان لە بۆنەکاندا بارۆکەی قژ ناکەنە سەریان، وەکو پێشتر باوی بووە، هەر بەو جۆرە بنەماڵە دەسەڵاتدارە ئەریستۆکراتییەکان دەیانویست.

بیتهۆڤن ئەو شتەی بیویستایە بەدەستی بهێنێت، دەیسەپاند بەسەر کۆمەڵەکەیدا، وەکو ئەوکاتەی سێ میرەکە ناچار دەبن مووچەیەکی ساڵانەی بۆ ببڕنەوە هەر بەو مەرجە ڤیەننا بەجێ نەهێڵن. بێگومان مۆزارتی بەدبەخت هیچ هەڵوێستێکی وایان بەرامبەر نەنواند، ئەمەش هەر کەوتە سەر شانی بتهۆڤن لاپەڕەیەکی نوێ بکاتەوە لە مێژوودا بەرامبەر هونەر و هونەرمەندان. ئەو بیروڕا و هەڵسوکەوتانەی بیتهۆڤن دەینواند، خەوی هەموو موزیکنووسەکانی پێش خۆی بوو، کە ئازادبن لە نووسین و بۆچوونەکانیاندا، بەڵام بۆیان نەدەلوا، ئیتر لەدوای ساڵی (١٨١٥)ەوە ئەم بارودۆخ و گۆڕانکارییانە هەموو لایەک دەگرێتەوە و موزیک دەبێت بە پیشەیەکی ئازاد.

ئەگەر فۆڕمی سۆناتە لای (هایدن و مۆزارت) جێگەیەکی تایبەتی هەبووبێت، ئەوا لای بیتهۆڤن جێگەیەکی زۆر بەرفراوانتر و دەوڵەمەندتر بەخۆوە دەگرێت.

هایدن یەکێک بوو لە مامۆستاکانی چوارینە، لەدایکبوون و پەرەپێدانی چوارینە هەر لە ساڵانی (١٦٠٠)ەوە دەستی پێکردووە، بەڵام بە تەنیا لە سەدەی هەژدەیەمدا لەگەڵ (هایدن)دا قورسایی خۆی وەرگرتووە و ئەوشێوە نوێیە دەپۆشێت. هەر لە داهێنان و چەسپاندنی هایدن خۆیەتی بەکارهێنانی ئەو چوار ئامێرە کەوانەدارەی (ڤایۆلینی یەکەم، ڤایۆلینی دووەم، ڤیۆلا، چەلۆ)، کە لە سەردەمی کلاسیکدا زۆر بەکار دەهێنرێن بۆ چوارینەکان و لەدوای (هایدن)ەوە مۆزارت و پاشان بیتهۆڤن دەیگەیەنێتە لوتکە.

جێگەی خۆیەتی ئێستا پرسیارێک لە خۆمان بکەین و تێبگەین هۆی چی بووە، بیتهۆڤن تەنیا نۆ سیمفۆنی نووسیوە؟

کەچی لەکاتێکدا هاوڕێکانی (هایدن و مۆزارت) دەگەیشتنە زیاتر لە سەد و دووەمیان لەسەروو چلەوە.

وەڵامەکەی لەوەدا خۆی بەدیدەکات، کە بتهۆڤن وەک نموونەی دانەرێکی سەربەخۆ بەئارەزووی خۆی ئەو بەرهەمەی نووسیوە کە دڵی پێوەی بووە، لەدوای ئەمەوە ئەگەر بەراورد بکەین و سەرنج بدەین دەبینین لە رۆژگاری (بیتهۆڤن)دا موزیکنووسەکان کەمتر سیمفۆنییان دەنووسی، چونکە هەموو درێژکردنەوەیەکی بەبێ هۆ زۆر نووسین لە بوارێکدا دووبارەکردنەوە و لەیەک چوونی زۆر تێدا بەدی دەکرێت، بەڵام ئەگەر بێت و سەیری سیمفۆنییەکانی

بتهۆڤن بکەین، دەبینین نەک هەر لە یەک ناچن، بەڵکو هەریەکەشیان تایبەتمەندیی خۆیان هەیە.

ئەگەر تێبینی بکەین، بۆمان دەردەکەوێت چۆن لەگەڵ رۆژگاردا ژمارەی نووسینی سیمفۆنی کەم دەبێتەوە و شێوەی دەربڕینی دەگۆڕدرێت.

بۆ نموونە:

فرانز جۆزیف هایدن ١٠٤ سیمفۆنی نووسیوە

ۆلفگانگ ئەمادیوس مۆزارت ٤١ سیمفۆنی نووسیوە

لۆدڤیگ ڤان بیتهۆڤن ٩ سیمفۆنی نووسیوە

رۆبێرت شۆمان ٤ سیمفۆنی نووسیوە

فلیکس مێندەلسۆن بارسولدی ٥ سیمفۆنی نووسیوە

پیتەر ئیلیش چایکۆڤسکی ٦ سیمفۆنی نووسیوە

یۆهان براهمس ٤ سیمفۆنی نووسیوە

ئەنتۆنین برۆکنەر ٩ سیمفۆنی نووسیوە

ئەنتۆنیۆ دیڤۆراک ٩ سیمفۆنی نووسیوە

گوستاڤ ماهلەر ٩ سیمفۆنی نووسیوە

بەڵام هەرگیز نووسینی بەرهەمی موزیکنووسێکی مەزن لەبەر گرنگێتی ئەوەندە نەکەوتۆتە بەر گفتوگۆ و سەرنجەوە وەکو سیمفۆنی نۆیەمی بیتهۆڤن، کە هەتا ئەمڕۆش بۆچوون و بیروڕای جیاواز هەیە لەسەری، لەوانەیە ئەگەر تەندروستی رێگەی لێ نەگرتایە، سیمفۆنی دەیەمیشی بنووسیایە، چونکە لە دەفتەری مسۆدەکانیدا کلێشەی بیرێکی وا بەدی دەکرێت.

سەرنج تیژیی و وزە ئەو رێگایانەبوون کە وایان لە بیتهۆڤن دەکرد سەرکەوتن بەدەست بهێنێت لە کارەکانیدا و بیکاتە رابەری نەوەی سەردەمێکی نوێ. هەوڵەکانی هەمووی جاڕدانە بۆ داهاتوویەکی نوێ لە موزیکدا. بەمشێوەیە توانی دەربڕینی نوێ بهێنێتە موزیکی سەردەمێکەوە، کە شێواز و فۆرمەکانی لە ڕەوڕەوەی مێژووەدا بناغەیەکی پۆڵاینی داکوتابوو لە ئەوروپادا و لە هەموو کۆشکەکانیدا بە شانازییەوە ئەم موزیکانە پێشکەش دەکران، لەبەر ئەوە گۆڕینیان کارێکی ئاسان نەبوو، چونکە ئەو جۆرە خەڵکە کلاسیکپەرستانە بە موزیک، لەسەر شێوەی کۆن چێژیان وەردەگرت. بۆیە بیتهۆڤن شۆڕشێکی گەورەی کرد، کەسێکە دەتخاتە بیرکردنەوە و قسەوە لەسەر کارەکانی و سەربەخۆ گفتوگۆت پێدەکات لەسەریان.

مۆزارت کاتێک موزیکی دەنووسی، زۆر بە ئاسانی و ئارامییەوە نۆتەکانی دەنووسییەوە و چێژیشی لەگەڵ دەبینین و بەبێ زۆر خەریک بوون میلۆدییەکی

بۆ دەهات، بەڵام بە پێچەوانەوە بیتهۆڤن زۆر ماندوو دەبوو پێیانەوە، چونکە بۆ نووسینەوەی بەرهەمێکی پیاداچوونەوەیەکی چڕ و کلێشەی جیاواز جیاوازی بۆ بیرەکانی دادەڕشت، چەندجارێک گۆڕانکاری تیایاندا دەکردنەوە و تاقی دەکردەوە، کە بزانێت ئایا دەگونجێت لەگەڵ ئەو بابەتەی کە دەیەوێت بینووسێت و مەبەستێتی، لەبەر ئەوەی ئەو موزیکانەی دایدەنان هێز و توانایەکی زۆر دەکەوتن لەسەری. لە نامەکانیدا زۆرجار خۆی سەرنجی هاوڕێکانی، یان چاپخانەکانی رادەکێشا بۆ ئەم ماندووبوونەی.

بەواتایەک ئەگەر وای دابنێین بیتهۆڤن دراماتیکە، ئەوا دەتوانین بڵێین کە مۆزارت تراژیدییە لە موزیکەکانیدا.

ڕۆژگار سەلماندی کەوا کەسانی وا هەمیشە دەیانپارێزێت و ناویان ون ناکات، کەسیش بەرهەمەکانیان لەیاد ناکات و هەر بە زیندوویی دەمێنێتەوە هەتا دواچرکەی کات. ئیتر هەر بەم شێوەیە بیتهۆڤن کۆتایی بە سەردەمی کلاسیک دەهێنێت و موزیک دەباتە قۆناغێکی نوێوە، کە ئەویش سەردەمی رۆمانتیکە...



پۆرتریتێکی سەردەمی کلاسیک



# کورتەباسێک سەبارەت بە قوتابخانەی (تەعبیری تەجریدی) لە هونەری شێوەکاریدا

ئامادەکردنی: ستار قادر

زاراوەی تەعبیری تەجریدی بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٩١٩دا سەبارەت بە ئیشەکانی (ڤاسیلی کاندنسکی )بەکارهێنراوە، هەروەها لە ساڵی ١٩٤٦دا لەسەر دەستی رەخنەگری ئەمریکی روبرت کۆتس بەشێوەیەکی تایبەتی لەسەر ئیشەکاتی دیکونینگ و جاکسون پۆلوک و ئەو هونەرمەندانەی شوێن پێیان هەڵگرتبوون، بەکاریهێناوە.

لە ساڵی ١٩٥١دا کاتێ ئیشی ئەم هونەرمەندان لە مۆزەخانەی هونەری نوێ لە نیویۆرک پیشاندرا، ئەم زاراوە هونەرییە بە رەسمی لە بوارەکەدا ناسرا، هەر لە ناوەکەیەوە ئەوە دەردەخات کە لە ئاوێتەبوونی هەردوو قوتابخانەی هونەریی (تەجریدی وتەعبیری)یە، واتە ئەبستراکت-تەجرید وەک نافیگەرەتیڤ لەگەڵ هەڵچوون و داچوونەکانی فشاری لێدانی فڵچەی تەعبیری و تێکشکاندنی

فۆرمەکان و شێواندنیان، لە گەڵ ئەوەدا ئەم رەوتە هونەرییە یەکسەر دوابەدوای قوتابخانەی تەعبیری، تەجریدییە، واتە بەپێی (تسلسل)ە مێژووییەکە نەهاتووە، بەڵکو لە منداڵدانی قوتابخانەی سوریالیزمەوە سەری هەڵدا، سەرەتا لەکارە هونەرییەکانی (ئاندرێ ماسۆنە)وە سەرچاوەی گرتووە: دواتر پۆلۆک و دیکۆنینگ و هونەرمەندانی تەعبیری تەجریدی تر بە ئیشەکانی ماسون.

هونەرمەندانی نەوەی شەستەکانی سەدەی رابردوو، کایە جیاجیاکانی وەک زمان و ناوەڕۆکی تابلۆ و هەتا خودی هونەرمەند خۆیشیان خستە بەر رەخنە، ئەم هەڵوێستەی هەندێکیان ئەوەی دەگەیاند کە دەسبەرداربوون لە گشت ئەو چالاکییە باوانەی (مألوف) کە پێشتر پێگەو جێگەی خۆیان هەبوو لە نێوەندە شێوەکارییەکەدا و هاتنە خوارەوە بۆ ئاستێکی نوێ و بەکاربردنی ماتریال و شتومەکی جۆراوجۆر (المواد المختلفة) وەکو ئەلتەرناتیڤێک دەرکەوتبوو، کە تەنگی بە بواری وێنەکێشان (رسم) هەڵچنیبوو، تاکو شوێنی بگرێتەوە، وەکو: فلیمسازیی جۆرەکانی هونەری ئەدائی... هتد.

دەرئەنجام هەروەک هەندێ لە هەنەرمەندان پەییان پێ بردبوو، کە دەکرێت سەرلەنوێ پرسیار بەرەو (وێنەکێشان) (رسم) چییەتی، وێنەکێشان بکرێت بۆئەوەی جارێکی دی لە فۆرمێکی جیاوازدا خۆی نمایش بکاتەوە، لە کاتێکدایە کە ئەم پرسیار و لەخۆپرسینەوەیە و گۆڕانە بەتەوژمانەی لە ئارادان بە تەنیا بەرەوڕووی هونەرمەندانی وێنەکێش نابێتەوە، بەڵکو لەسەر ئاستی گشت رووبەرەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و رۆشنبیریش... هتد، سەبارەت بەو مەودا نوێیانەی لەبەردەمیدان رەنگی دابووەوە.

لە ساڵانی شەستدا بوو خەڵکی بەگشتی لە شاشەی تەلەفزیۆن و لەسەر مانگەوە دیمەنی ئەو ئەستێرەیەیان بینی کە خۆیانی لەسەر دەژین (کە گۆی زەوییە)، هەروەها تەکنۆلۆژیای گەشەسەندووی باڵا ئەوەی بەرهەمهێنا کە گوزارشتێکی تەشکیلییانە لە کۆپیکردنی رەنگە زیندووەکان بکات، ئەمە وایکرد بۆچوونی هونەرمەندانی وێنەکێش فراوانتر بکات لەسەر ئەو رووبەرەی ئیشی تێدا دەکەن، تا دەهات لە بواری هونەری جوڵەدا (الفن الحركي) بینەرانی تووشی شک دەکرد، بەتایبەتی لە بواری ڤیدیۆییدا بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆو بەگشتی مەودا دوورەکانی مرۆڤ گۆڕدرا بەرابەر جیهانی دەوروبەری، هونەرمەندان لە زەمەنێکی ونبوو لە زەمەنی خۆیاندا دەژین، بە بەردەوامی لە گەڕاندابوون بۆ دۆزینەوەی فۆرمێکی نوێ بۆ گوزارشتکردن لەو کێشە میتافیزیکییانەی پەیوەندییان بە بوونی ئینسانەکانەوە هەیە، ئەو فۆرمە باوانەی ئەو رۆژە دەرەقەتی نەدەهاتن.

ڕووداو کاریگەرییەکانی دەرەوەی رووبەری شێوەکاری بەشێوەیەکی توندوتیژ و بەتەوژم کاریان لە وێنەکێشان دەکرد، بۆیە (دیدی ناوەکیی- النظرات الداخلية) تاکە هاندەرێکی هونەرمەندان بوو لەو رەوتە هونەرییانەی وێنەکێشان ئیشیان پێ دەکرد، هاوکات هونەری بازرگانی کە لەسەر تابلۆ ریکلامییە رەنگاورەنگەکان و شاشەی تەلەفزیۆن بلاّودەبوونەوە، وێنەکێشەکان دەستیانکرد بە گەڕان بەدوای شێوازە فانتازییە هونەرییە بازرگانییەکان و زۆربەی زۆری هونەرمەندە ئەبستراکتەکان و وێنەکێشانی (بواری رەنگاورەنگ) لەڕێگەی فراوانبوونی سیحری تابلۆ- ریکلامییەکان- شاشەی ڤیستاڤیشن، هاوکات هونەری بازرگانی و هونەری ماشێنی بەشێوەیەکی گشتی هەڵسان بە توێژینەوە لەسەر بنچینەی ئەوەی کە بەشێکن لە دنیای بەکاربردن، وەبەرهێنانەکانی هونەری تەکنیکی نوێ تا دەهات روو لە زۆربوون بوون، وەکو لە بوارەکانی بەرهەمهێنانی بازرگانی و سیاسەت و رۆشنبیریشدا بەدەرکەوتن، لەگەڵ ئەمەشدا دەنگوباسی کەتالۆکە (کراس) قەبە و گەورەکان و زۆربوونی چاپەمەنی و چالاکی دامودەزگاکان لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی بەرفراواندا بەرامبەر یەکتری وەستان. لەو هونەرمەندانەی نەیان دەویست لەگەڵ ئەم شێوازە نوێیەی کە لە رووبەرە شێوەکارییەکە هاتبوونەکایەوە، بتوێتەوە (مارسیل دوشامپ) بوو لە شێوازە ناهونەرییەکانی (اللافنية)، دوشامپ لەو ماوەی پەنجا ساڵەدا رووەو رێڕەوی هەڵخەڵەتاندنی ئامێرەکان دەڕۆیشت، تا دەهات لێکۆڵینەوەکان بەرەو زیادی دەچوون لەسەر حاڵاتی بابەتی هونەری، رۆڵی خودی هونەرمەند خۆیشی چەندین هونەرمەند لە حەفتاکاندا وەک بەشێکی جیانەبووەوە لە خودی هونەر بەردەوام بوون. لەگەڵ ئەم باکگراوندە مێژووەی باسکران، بەردەوام بوو، ئەگەر چی ئەم بەردەوامییە پەیامی مەرگی خۆشی لەگەڵدا بێت: لە سێ رەوتی سەرەکیدا دەبینرێت: یەکەمیان، ئیشیان بە ماددەی راستەقینەی هونەر لەگەڵ زمانی رەسم خۆی، واتە وێنەکێشان لەپێناوی وێنەکێشاندا، کە زۆربەی هونەری باڵای ئەم ساڵانەی دوایی ئەمریکی دەگرێتەوە. ئەو وێنەکێشانەی کە لەدوای جاکسۆن پۆلۆک هاتن گرنگییان بە بەهای رووبەرە رەنگییەکان دەدا، لەو هونەرمەندانە: مارک رۆشکۆ و بارنیت نیومان و مۆرلی لویس و کینت نۆلاند و فرانک ستیلا بوون.

دووەم رەوتیان دەگەڕا بەدووی چارەسەری (خەیاڵی سیمبولی) لە رێگەی ئەزموونە سەرکەوتووە دۆزراوەکانی وێنەکێشان، کە بۆ پڕکردنەوەی ئەو کەلێنەی نێوانی ژیان و هونەر بەدەرکەوت، لێرەدا زۆری هونەرمەندە بەتواناکانی

ئەم ڕەوتە، زۆربەیان ئەمریکی بوون، کە سەرچاوە سەرەکییەکانی کەرەستەی چاپەمەنی هێنایە ناوەوە تا ئاوێتەکردنی تواندنەوەی لەناو وێنەکێشاندا، لە دیارترین هونەرمەندانی وێنەکێشی ئەم ڕەوتە: جاسپەر جۆنز (١٩٣٠) و ڕۆبەرت ڕۆشەنبێرگ (١٩٢٥) و ئاندی وارهۆڵ (١٩٣٠) بوون.

بەڵام سێیەم ڕەوت لە (وێنەکێشان) بەزاندنی کەرەستەکان بوو، بۆیەکان وەک ئایدیایەک خۆیان دەنواند، کە زیاتر خەسڵەتە ئەوروپییەکەی هەڵگرتبوو، لە باشترین پەیڕەوانی ئەم ڕەوتە لە وێنەکێشان لە سەرەتای ساڵانی شەستدا ئەم هونەرمەندانە بوون: ئیف کلاین (١٩٦٢ - ١٩٢٨) و بیرمانزۆنی (١٩٦٣ – ١٩٣٣).

ئەم سێ ڕەوتە لە وێنەکێشاندا لەگەڵ ئەوەی هاوڕان، لەگەڵ یەکتر ڕێیان دەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ جار تێکەڵ بەیەکتری دەبوون و سیمای هونەرییان نەدەناسرایەوە، شێوازی (دڵۆپاندنی پۆلۆک) و جەختکردنی لەسەر ڕەنگەکان سادەیە، ڕووبەرەکان کۆنترۆڵی هونەری وێنەکێشانی ساڵانی پەنجاکانی کردبوو، وێنەکێشان لەلای هەردوو هونەرمەندان مارک ڕۆشکۆ و بارنیت نیومان وەک کایەیەکی بارگاوی بەبەها ڕۆحییەکان و گوزارشتێکی پەتییانەیان دەدایە قەڵەم، هەروەها لەلای (پۆلۆکیش) هەر بەهەمان شێوە بوو. بە وتەیەکی تر، ئەم هونەرمەندانە ڕۆمانتیکی بوون، مەبەستیان تەڕوبڕیی ئیحساساتەکانیان بوو کە ئیشەکانیان بەرەو باڵا ببات.

ڕۆشکۆ وتەنی (دەبێ تابلۆکان وەک پەرەجو (معجزە) وابن)، هەروەها لەگەڵ مۆریس لویس کە ساڵی ١٩٦٢ کۆچی کرد و هەر لە سەرەتای ساڵانی شەستدا خۆیان بە کاهینێک ناوزەد کردووە لە بواری وێنەکێشانی ڕەنگاوڕەنگدا، تابلۆکانی ڕۆشکۆ بەشێوەیەکی تایبەتی وەک مێرگێکی هێمن خۆیان دەنواند.

مۆریس لویس هەتاڕادەیەکی زۆر لەگەڵ شێوازی ئیشکردنی ڕۆشکۆ و نیومان یەکیدەگرتەوە، باشترین ئیشی تابلۆیەکی گەورەیە بە شێوازی دیاردەیی (ظاهري) دروستی کردبوو، کە لە تابلۆکەدا ڕێگەی بە هێڵە ستوونییەکانی داوە لە پانتایی تابلۆکاندا پەخش ببنەوە، نیوەی لە تابلۆدا فەرامۆشی کردووە، تاکو تابلۆکە بکرێتەوە، هەروەها ڕێگەی داپۆشینی تابلۆکە بە ڕەنگە درەوشاوەکان بە دەردەکەوێ.

هەر لەو ماوەیەدا ستێلا و نولاند و جولز ئەلتیسکی (١٩٢٢)و لای بونز (١٩٣٧) و لە ئینگلتەراش جۆن هویلاند (١٩٣٤) و جون ویلکر (١٩٣٦) هەڵسان بەلاسایی و فراوانکردنی پانتایی ئیشکردنی شێوازی وێنەکێشانی (تەعبیری تەجریدی) لەڕووی ئایدیاوە پەرەیان پێ دا: کە خاڵی بێت لە دەلالەتی دیاردەیی و ناوەکییەکان.

ئەم شێوازە ئەگەرچی بە ئەبستراکتی (پێش وێنەکێشان) ناسرابوو، بەلەبەرچاوگرتنی سافی دیار نەبوونی جێ فڵچەکان لەسەر رووی تابلۆکە، ئەم شێوازە وێنەکێشانە باڵی کێشابوو بەسەر هونەری ساڵی شەستدا و هاوکات لەگەڵ گۆڕانکاریی ستایلەکان و شێوەکانی (کانفاس) و پرژاندنی رەنگ لەسەر کانفاسی پانتاییە گەورەکان، شێوەیەکی ئاسایی وەرگرتبوو، ئولونسکی و نویمان رسواس کلیلی (١٩٢٣) چوونە سەر بوارێکی تری شێوەکانی کە پەیکەرسازییە، بە پێچەوانەشەوە چەند پەیکەرسازێکیش: لەوانە (ئەنتۆنی کارو) هاتنە سەر وێنەکێشان، کە لەمیانی وێنەکێشاندا رەنگەکانی بەشێوەیەکی (نا مالوف)و غەریب بەکاردەهێنا.

لە پانتاییە شێوەکارییەکەدا، پەرەسەندن و گەشەیەکی باش لە بوارەکانی شێوەکاری دەبینرا (هونەری پۆپ- Pop Art)، کە زیاتر لە هەرشتێکی دی پشتیان بەو هەستە تیۆرییەکان (الاحساسات النظرية)'بەستبوو لەمیانی ئیشکردنیاندا، لەو هونەرمەندانەی بۆ چەند ساڵێک لەسەر ئەم شێوازە هونەرییە ئیشی کردبوو و بەردەوام بوو، فازرلی (١٩٠٨) بوو.

هەروەها هەوڵەکانی هەریەک لە کۆمەڵەی (ریکرسە) هونەری شێوەکاری لە فەرەنسا تابچنە ریزییەوە، واتە بۆ ئیشکردن لە هونەری پۆپدا، لەو هونەرمەندانەی ئەم کۆمەڵەیە: جولیۆ لوبارک (١٩٢٨)و فرانسوا موریلی (١٩٢٦) و لەگەڵ هونەرمەندە ئیتاڵییەکانی وەک: جیانی کولمبوو (١٩٣٧) ئەلبوتوباسی (١٩٣٧)، هەروەها لە کۆمەڵە هونەرییەکانی (T) و (N)، هەریەک لەم کۆمەڵە و ئەندامانیان هەوڵیان دەدا لایەنی توانستی جێبەجێی ئەم بوارە بخەنە روو، هەر لەمیانی ئەم بوارەدا، واتە (هونەری پۆپ) ژنە هونەرمەندی ئینگلیزی (برجیت رایلی) بەشێوەیەکی خۆڕسک ئیشی دەکرد، دواجار لە ئاوێتەبوونی (هونەری پۆپ) و (لەدوای وێنەکێشان- مابعد رسم) خرۆشان و جوڵەیەکی بەخۆیەوە بینی، ئەو وێنەکێشانەی رۆڵی سەرەکییان هەبوو، هونەرمەندان (نولدەر ستیلا و رایلی) بوون. لەم کاتانەدا و لەم جموجۆڵی رەسمکردنەدا ستایلی بەکارهێنانی رەنگ لە وێنەکێشاندا هاتە کایەوە، ئەمە زیاتر بۆ مەبەستی هەڵخەڵەتاندنی چاو بوو، بەتایبەتی لە تابلۆ گەورەکاندا، بۆ ئەو مەبەستە بەکاردەهێنرا تا بینەرانی نووقمی تابلۆکە بکات و تووشی تێرامانێکی قووڵی بکات، ئەم هێڵی ئیشکردنە لە وێنەکێشاندا کاریگەرییەکی راستەوخۆی لەسەر هەست (الحس) هەبوو، بە پێچەوانەوەشەوە زۆریی بەکارهێنانی کەرەسەکان رێگەیەکی هونەری تر هاتەکایەوە و گەشەیەکی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی، کە ئەمەیان دووربوو لە

جێبەجێکردنی وێنەکێشان بە بارە ڕێکوپێکییەکەی، هەروەها تابلۆکان بێبەری بوون لە ڕەنگە گەش و درەوشاوەکان، تاکو وێنەکێشان زۆر ئەکتیڤانە عەقڵ بدوێنێت و بیرۆکەی ئەوەی کە (ڕەسم) بگەیەنرێتە ئەوپەڕی گوزارشت پێکردنی، ڕێگەی کورتکراوە و کەمکردنەوەی ڕەگەزە سەرەکییەکانی گرتەبەر، لەڕاستیدا ئەم ئامانجەی کە ڕەوتی وێنەکێشان مەبەستی سەرەکی بوو، شتێکی نوێ نەبوو، پێشتر لەلایەن (مارسیل دوشامپ)ەوە ئیشی پێکراوە، کە جەختی لەسەر (کورتکردنەوە، کورتکردنەوە، کورتکردنەوە) کردووەتەوە.

دەرئەنجامی نیشانەکانی بەجێهێنانی کورتبڕی و کورتکردنەوە لە وێنەکێشاندا، وێنەی مۆنۆکرۆمی Monocromی بەرهەمهێنا، کە نەوەی نوێ هونەرمەندان دەستیاندایە، لە سەرەتاوە لە تابلۆ سپییە بێگەردەکانی (کازیمیر مالڤیش)ەوە سەرچاوەیان گرتووە، مالڤیش چەند تابلۆیەکی دروستکردووە، کە ڕەنگی سپی لەسەر ڕووی سپی کانڤاسی تابلۆکە داناوە، لەوانە چوارگۆشەیەکی لار لەسەر تابلۆیەکی سپی. لەگەڵ جیاوازیی هەریەک لە هونەرمەندان بۆ پەنابردنە بەر کورتکردنەوە لەکاری هونەرییدا، فاکتەرێکی تر هەیە کە خاوێنییە و هەڵدەستێ بە پاکژکردنەوە و نەهێشتنی زیادەکانی وێنەکێشان و گشت شتەکانی بەدەر لە وێنەکێشان. زۆر بەکارهێنانی ڕەنگی سپی بەها (مادیییەکەی) وەلانانرێت، گەر سەرنج بدەین لەو کۆمەڵە تابلۆ سپییانە (Whit Painting) ڕۆبەرت ڕانسچێرنبێری (Robert Ranschrnbery ) لە ساڵانی (١٩٥١-١٩٥٢)دا پیشانی دا لەو ڕۆژگارەدا تابلۆکانیشی بریتی بوون لە ڕووبەر و پانتاییەکی بێگەردی سپی، مەبەست لە پیشاندانی ئەو تابلۆ خاڵییانە لە ڕەنگ و سپی پۆشانە بە کانڤالس، مەبەستی سەرەکی ئەوەبووە کە سێبەری بینەرانی دەکەوێتە سەر تابلۆ سپییەکان، بە وتەیەکی تر تابلۆکان، دەبنە پەردەکانی دواوە، کاتێ ئەم تابلۆیانە بۆ یەکەم جار پیشاندران، بە باشی ئەو تێکەڵبوونی تابلۆ ئەبستراکتە سپییانە لەگەڵ چوارچێوە کراوەیەی کە ڕەگەزی تازە لەخۆ بگرێت، بەتایبەتی لە لەحزەکانی پیشاندانی وەستاوە، کاتێ بینەران لەناو هۆڵی پیشاندانیدا سێبەرەکانیان دەکەونە سەر تابلۆ سپییەکان. لە ئیشەکانی دوای ئەم قۆناغەی هونەرمەند کۆلاجکراوی خستەڕوو، کە کۆکردنەوەی چەند ڕەگەزێکی بەبێ هیچ پێشینەیەکی بۆ ئەم ئیشەی ئەنجامدابوون، لەگەڵ ئەوەشدا لەهەندێ ئیشیدا و بەتەواوەتی قووڵ بووەتەوە لەناو چەمکە فیکری و ڕوئیایەکانیدا، وەک لە ئیشێکیدا ئامێری (ڕادیۆ)ی بەکارهێناوە، چونکە خۆی وتەنی پێی وایە (گوێگرتن لە ڕادیۆ لە زەمەندا ڕوو دەدات)، بۆیە بینەرانیش هەر لە زەمەندا بەر ئیشەکان دەکەون لە

چوارچێوەی ڕووبەری ئەم جۆرە ئیشکردنە لە هونەری شێوەکاریدا.

هونەرمەند جاسپەر جۆنز لە ئیشە سەرەتاییەکانییەوە لەم بوارەدا ڕووبەرێکی دۆزییەوە کە ڕێی بە بابەتە فیکرییەکانی دا کە لەناو خودی ئیشەکە خۆیدا تەواو بکات. بۆ نموونە ئەو مفرەداتەی بەکاردەهێنا کە پەی بەو ئایدیایە ببات کە مەبەستی وەک ژمارە و پڕوپاگەندە و (نیشانەی تیراندازی) (اهداف الرماية) و ئاڵای ئەمریکا، کە وەک ڕەخنەگر برینبرج ئەم شێوانەی بە (دوای تەعبیری تەجریدی Post Abstract expressionism) ناوزەد کرد.

ئەم فۆرمانە دایەلۆگی لەنێوان وێنە (Image) و شێوەی نواندنی لە کاری هونەریدا هێناوەتەکایەوە، جۆنز پێی وایە (ئەم فۆرمانە ناتوانرێت دووبارە بەرهەم بهێنرێتەوە)، بۆیە جۆنز وای کە ئیشی هونەریی تەماشەکەرانی بدوێنێت و دایەلۆگی بینین بکەوێتە نێوانیان: وەک لە تابلۆی (تانجۆ)دا جۆنز سندووقێکی مۆسیقی بچووکی لەسەر باکگراوندێکی شین داناوە، لەلای سووچی سەرەوەی تابلۆکەدا وشەی (تانجۆ)ی نووسیوە، هەر بەهەمان ناوەوە تابلۆکە ناونراوە، هونەرمەند جاسبەر جۆنس سەبارەت بەم دیاردەیە دەڵێت: لەم ئیشانەمدا ویستوومە ئیحای ئەو پەیوەندییە جەستەییە چالاکەی نێوان تەماشاکەر و تابلۆکان بخەمە ڕوو.

سەرچاوە:

١-مابعدة التعبيرية التجريدية، كارولين و وليم فيفر.

٢-الفن التشيلي المعاصر، محمود امهز.

٣-النقد الفني، زياد سالم.

# فیلمە هیندییەکان چەندە لە حەقیقەت نزیکن؟

و. لە فارسییەوە: ئازاد بەهین

کاتێک سەیری فیلمە هیندییەکان دەکەیت، هەمیشە لە شتێک دڵنیایت: دوو عاشق و دڵدار، هەرچەندە لە دووری و جیاییدا تاڵی بچێژن، لە کۆتاییدا تامی شیرینیی بەختەوەریی دەچێژن. سینەمای هیند تا چ رادەیەک ژیانی واقیعی هیندییەکان دەخاتەڕوو؟

خۆشەویستی بێ کۆتایی، دڵخۆشیی خەیاڵئاسا، تامی تاڵی خەم، رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ تاقیکردنەوە دژوارەکان و دوو دڵدار کە خۆشەویستییەکەیان دەخرێتە بواری تاقیکردنەوەوە. ئەوانە پێکهاتەی هەمیشەیی فیلمە هیندییەکانن کە سەرەڕای کۆن بوون، هێشتا بە ملیۆنان کەس شەیدای خۆیان دەکەن و دەیانکێشنە هۆڵی سینەما.

ئەو فیلمانە لە راستیدا ئەو ئەفسانانەن کە هەموویان کۆتاییەکی خۆشیان دەبێت، هەرچەندیش تاڵیی چارەنووسی قارەمانانی چیرۆکەکە فرمێسک لە چاوان بێنێت، بەڵام لە کۆتاییدا بەختەوەرییان حاشا هەڵنەگەرە و هیچ گومانێکی تێدا نییە.

هەرچەند کە سیستمی چینایەتی لە هیند بە فەرمی لە دەستووری ئەو وڵاتە-پەسەندکراوی ساڵی ١٩٥٠-لابردرا، بەڵام هەروا لەناو کۆمەڵگا بەتایبەت لە ناوچە لادێ نشینەکاندا ژیانی خەڵکی خستووەتە ژێر کاریگەری خۆیەوە. هەر لەبەر ئەوە عاشقبوونی دەوڵەمەند بە هەژار، یان هیندۆ بە موسڵمانان چیرۆکێکە کە تەنیا لە سینەمادا دەتوانرێت سەیری بکرێت، چونکە حەقیقەت و راستی رەنگێکی دیکەی هەیە.



### چیرۆکە ناڕاستەقینەکان

شارە گەورەکانی وەک دەلهی، بۆمبای یان کلکتە تەنیا بەشێکی بچووک لە دانیشتووانی ١ ملیارد و ٢٠٠ ملیۆن کەسی هیندیان لەخۆ گرتووە. بەپێی دوایین سەرژمێرییەکان کە ئەنجامدراوە لەو وڵاتە، لە ساڵی ٢٠١١ دوو لەسەر سێی هیندییەکان هەروا لە ناوچە لادێییەکاندا نیشتەجێن و خەرج و تێچووی ژیانی خۆیان بە شێوەی راستەوخۆ، یان ناڕاستەوخۆ لە رێی کاری کشتوکاڵییەوە دابین دەکەن.



بەپێی ئاماری یونیسێف کە ساڵی ٢٠١٢ ئامادە کراوە، لە هیند ٩٠٪ی هاوسەرگیرییەکان بەپێی بڕیاری دایک و باوک و لە پێشدا دیاریکراون. هەرچەند لە ساڵانی رابردوودا لە ناوچە شارنشینەکاندا ئەو کچ و کوڕانەی کە یەکتریان ناسیوە و چوونە ناو ژیانی هاوسەرگیریی، لە رێی خۆشەویستییەوە بووە، لە زیادبووندایە.



دیاردەی هاوسەرگیریی لەنێوان هیندۆکان کە ٨٠٪ و موسڵمانان کە ١٦٪ی کۆمەڵگا



پێکدێنن، زۆر دەگمەنە، بەڵام سەرەڕای ئەوە ئەو بابەتە کە لە کۆمەڵگەی هیند بە تابۆ دەژمێردرێت، تا ئێستا دەستکەوتی ٤ فیلمی بالیوودی بووە. شارۆخ خان و سەیف عەلی خان، دوو ئەستێرەی بالیوود لەو نموونە دەگمەنانەن کە بۆ خۆیان سەرەڕای موسڵمان بوون، لەگەڵ ژنانی هیندۆ چوونە ناو ژیانی هاوسەرگیرییەوە.

کونال کوهلی، دەرهێنەرێک کە بە فیلمەکانی "تۆ و من" و "فەنا" ناوی کەوتە سەر زمانەکان و ناوبانگی دەرکرد، سەبارەت بەوەی کە فیلمە بالیوودییەکان تا چ رادەیەک توانای گۆڕینی کۆمەڵگەی هیندی هەیە، بە رەشبینییەوە دەڵێت: "ئەگەر فیلمەکان بە راستی دەیانتوانی کاریگەری لە سەر خەڵک دابنێن، هەموومان دەبوایە زیاتر بزە و پێکەنیمان خستبایە سەر لێوی یەکتر، یان ورە و جەسارەتی زیاترمان لە عاشقبوون دەبوو، بەڵام ئەو رووداوانە روو نادەن".

جاوید ئەختەر، نووسەری ناسراوی هیندیش لە سەر ئەو باوەڕەیە: "ئەو فیلمانە بە دڵنیاییەوە رووداوەکانی کۆمەڵگە دەخەنەڕوو، بەڵام زیاتر لە هەموو شتێک رەنگدانەوەی ئاواتەکان، هیواکان، بەهاکان و نەریتەکانن. ئەوان لە راستیدا بە ئاوێنەی کۆمەڵگە لە قەڵەم نادرێن، بەڵکو ئەو خەون و خولیایانەن کە کۆمەڵگە خەونی پێوە دەبینێت".

## پێشوازی ساردی بینەران لە ناوەرۆکە جیاوازەکان

فیلمی "Dirty picture" بەرهەمی ٢٠١١ بە بەشداری ڤیدیا بالان لە رۆڵی سەرەکی، نموونەیەکی باشە بۆ تێگەیشتنی پێشوازی بینەرانی هیندی لە فیلمەکان بە ناوەرۆکە جیاوازەکان.

ئەو فیلمە باس لە ژیانی ژنێکی پڕ ورە بە ناوی "سیلک" دەکات، کە لە فیلمە ئێرۆتیکەکان رۆڵ دەگێڕێت. هەرچەند ئەو دەتوانێت ناوبانگ دەربکات، بەڵام لە کۆتاییدا بەهۆی دوورخرانەوە و وەلانرانی لە لایەن کۆمەڵگاوە، تەنیا رێگە چارەی خۆی لە کۆتاییهێنان بە ژیانیدا دەبینێتەوە.

سیلک لە بەشێکی ئەو فیلمەدا دەڵێت: "بۆ ئەوەی بتوانێت فیلمی سەرکەوتوو دروست بکەیت، پێویستت بە سێ شت هەیە: سەرگەرمی، سەرگەرمی، سەرگەرمی".

هەرچەند ئەو فیلمە لەگەڵ پێشوازی گەرمی رەخنەگران بەرەوڕوو بووەوە و لە فێستیڤاڵە بیانییەکاندا نمایش کرا و چەند خەڵاتێکیشی بەدەستهێنا، بەڵام لە سینەما هیندییەکاندا سەرکەوتوو نەبوو.

ڕەنجینی ماجومدەر، مامۆستای زانستگای جەواهیر لەعل نەهرۆش لەسەر ئەو باوەڕەیە کە سەرگەرمکردنی بینەر، بە گرنگترین تایبەتمەندی فیلمێکی سەرکەوتوو دەژمێردرێت. ئەو بە دویچەڤلە دەڵێت: "سینەما واتە سەرگەرمی. ئێمە ناتوانین ئەو چاوەڕوانییەمان لە دەرهێنەرەکان هەبێت کە ڕاستییە تاڵەکانی کۆمەڵگە بخەنەڕوو. لە سینەمای بازرگاندا ئەوە بە ئەرکی دەرهێنەر ناژمێردرێت".

سەرەڕای ئەوانە فیلمی "Dirty picture" ڕوانگەیەکی نوێی لە سینەمای بالیوود هێنایە ئاراوە. ژنان لە سینەمای هیند ساڵانێکی زۆر تەنیا وەک بەشی جوانی دەبیندران، بەڵام دوای دروستکردنی ئەو فیلمە، شەپۆلێکی نوێ لەو فیلمانە دەستی پێکرد، کە چیرۆکی ژنانی بەهێز و زۆرتر سەرکەوتوو دەگێڕنەوە.

لە ساڵانی ڕابردوودا تەنیا ژمارەیەکی کەم لە فیلمە بالیوودییەکان ڕاستییەکان و حەقیقەتەکانی کۆمەڵگەی هیندیان وێنا کردووە و خستوویانەتەڕوو. فیلمەکانی "مەقبوول" و "هەینی ڕەش" دوو نموونەن لەو جۆرە فیلمانە. "مەقبوول" بەرهەمی ۲۰۰۳ دەپرژێتە سەر چالاکی باندە مافیاییەکان لە هیند و "هەینی ڕەش" بەرهەمی ۲۰۰٤ باس لە نائارامییەکانی نێوان هیندۆکان و موسڵمانان دەکات لەسەر بنەمای ڕووداوە ڕاستەقینەکان.

هەرچەند زۆرێک لە ڕەخنەگران ستایشی ئەو دوو فیلمەیان کردووە، بەڵام ئەو فیلمانە تەنیا لە ژمارەیەکی کەم لە سینەما ناوخۆییەکان و بە گشتی لە فێستیڤاڵە بیانییەکاندا نمایش کران.



**سەرچاوە:**

سایتی www.dw.de، بەشی فەرهەنگ و هونەر

# خوێندنەوەیەک بۆ فیلمی عەشق "Amour"

## لە دەرهێنانی هانکە "Michael Haneke"




ن: رازیە مەهدی زادە

و. لە فارسییەوە: هیوا سەلیمی

کرانەوە و داخستنی دەرگا و پەنجەرەکان، چوونە ناو هەرێمی عەشق و ژیانە...

جوگرافیای فیلم لەنێوان دەرگا و پانتاییماڵێکدا خۆی بە بینەر نیشان دەدات. لە یەکەمین رووبەڕووبوونەوە و لەگەڵ هاتنەژوورەوەی پۆلیسی ئاگرکوژاندنەوەدا پیانۆیەکی گەورە دەبینرێت، کە بیرهێنەرەوەی سەردەمی شکۆداری دوو مامۆستای بەساڵاچووی پیانۆ و سەرەتای دەستپێکردنی پەیوەندی و چیرۆکی عەشقی ئەوانە.

هاتنەژوورەوەی بەردەنگ بۆ شانۆی شانزەلیزە یەکەمین رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ جووتە کارەکتەر و پاڵەوانە سەرەکییەکانی فیلمەکەیە. ئەم دوو کارەکتەرە بە بێ هیچ جیاوازییەک لەگەڵ ئەوانی تر لە هۆڵی بەڕێوەچوونی مۆسیقادا دانیشتوون. توێژێکی بۆرژوا و رۆشنبیر کە بیرهێنەرەوەی دیسیپلینی سیستمی

ئاپۆلۆنی نیچە لە خولقاندنی تراژدیان. دیسیپلینێکی ئاپۆلۆنی کە دواجار بە بڕیارێکی دیونیزۆسی خۆی و هاوچینەکانی تێکدەشکێنێت. کۆڵەکە و تەوەری سەرەکی لە سەرەتای فیلم و لە سەرجەمی کاتەکانی بەڕێوەچوونی کۆنسێرتی مۆسیقادا، ئامادەبووانی کۆنسێرتەکەن. هەروەها ژێر بەژێریش هێمایەکە بۆ ئاپاراتۆسی سینەمایی، کە راستەقینە نیشاندانی وێنەکانی کاتی پەخش بە یەکەمین هەنگاو و ئەرکی خۆی دەزانێت. ئەم جۆرە تێروانینە بەر لە ساڵەکانی ١٩٧٥ پشتی بە مەدلولبوونی بینەر دەبەست و دواتریش پێداگری لەسەر دالبوون و سەرەکیبوونی بینەر و بەردەنگ دەکردەوە. هەروەک لەم وێنەیەدا دەبینرێت خاڵی جێگەی سەرنج بەردەنگ و وەرگرەکانن.

مەودایەکی درێژ و سارد لە گرتە و وێنە جیاجیاکانی فیلمەکەدا بوونی هەیە، هەروەک گەڕانی کامێرا لە شەودا و لە شوێنەکان و لەنێوان کورسی و کۆمەڵێک کەلوپەل، کە باس لە چەندین ساڵ پەیوەندی و تەمەنێک لە ژیان دەکات. کەلوپەلێکی شێواو کە بیرهێنەرەوەی ئاوابوونی ئانتۆنیۆنی و بەجێمانی شوێنەکان و بیرەوەرییەکانە. لە گرتەیەکی تردا ئەم مەودایە بە نیشاندانی چەندین تابلۆی وێنەی هەڵواسراو لە ماڵەکەدا دووبارە دەبێتەوە، کۆمەڵێک تابلۆ کە هەرکامەیان وەرز و بارودۆخ و رەنگی تایبەت بە خۆیان هەیە، بەجۆرێک نیشاندەری تەمەن و بەڕێکردنی ژیان و وەرزەکان لە ژیانی ئەم جووتە هاوسەرە پیرەیە. دوو پاڵەوانی سەرەکی لە چینی کۆمەڵایەتی خۆیان هەڵبژێردراون و چوونە ژوورەوە بۆ ناو ماڵە پڕ لە پەرتووکەکەی ئەوان، سەرەتایەکە بۆ ئاشنابوونی بینەر و بەردەنگ لە جۆری چین و بیرکردنەوە و شێوازی پەیوەندی ئەوان.

شەونخوونی ژنە لە بێدەنگی و تاریکی شەودا، بە جۆرێک ئاماژەیە بۆ ترس و دڵەڕاوکێ. ترسێک لە رەگەزی مانەوە لەسەر سنوور و تێپەڕین لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تر، ترس و دڵەڕاوکێیەکی ئێگزیستانسیالیستی و کیەر کیگاردی.

ژنەکە بیر لە ترس و دڵەڕاوکێکانی مەرگ و دەسپێکردنی نەخۆشییەکەی دەکاتەوە، ئەو لەنێوان دوو غەریزەی مەرگ و ژیاندا دەسوڕێتەوە، غەریزەی مەرگ کە روو لە کۆمەڵگا و مرۆڤایەتی دەکات و غەریزەی ژیان کە جۆرێک لە سەربەخۆیی و تاکگەرایی دەخولقێنێت، ترس لە ژیان، کە ترسە لە تەنیایی و جیابوونەوە، ترس لە مەرگ، کە ترسە لە ونبوون و توانەوە لە جیهاندا.

لە گرتەیەکی تردا، پیاوەکە لە تاریکی و بێدەنگی شەودا بەخەبەرە و بیر دەکاتەوە، پیاو لە کێشمەکێشی بوون و هەڵبژاردن و بەرپرسیاریەتی بۆ بەردەوامبوونی خۆی و ئەوی تردایە. ئەویترێک کە ساڵانێکە شەریکی خۆشی و ناخۆشییەکانی ژیانییەتی.

بەلۆعەی ئاو خاڵێکە بۆ بیرکردنەوە، لە نەخۆشکەوتنی "ئەو" و دەستپێکردنی قەیران دەدوێت و لە وێنەی کۆتایی ئەم گرتەیەدا بەلۆعەی ئاوەکە دەگرێتەوە و هەواڵی سەرکەوتن بەگوێماندا دەدات. "ئەو" بۆ جارێکی تر بۆ ژیان گەڕاوەتەوە، مەرگ هاوڕێی لەدایکبوونە و ڕۆتینی ڕۆژانە لە زەینی پیرە پیاوەکە بە گرتنەوەی بەلۆعەی ئاوەکە بۆ جارێکی تر دەستپێدەکاتەوە. سەرلەنوێ لەگەڵ ژنەکەی ژیان دەست پێدەکاتەوە، هاوشێوەی ئەوەی کە عەشق و مەرگ واتاگەلێکی لەیەک تەنراو و هەڵپێچراون. عەشق بە کۆتایی ژیان و مەرگ دەوڵەمەند دەبێت و مەرگ ڕۆڵی کۆڵەکە و بنچینە بۆ عەشق دەگێڕێت. لە سۆنگەی ئوستوورەناسییەوە عەشقبازی لەنێوان خوداوەندە نەمرەکانی کێوەکانی ئۆلۆمپیوس "ئالەمپ" هەڵگری چەشنێک لە بێزاری بووە. بۆ نموونە عەشقی نێوان زیۆس و ژینۆ تا ئەو کاتەی بەرەوڕووی کۆتاییهاتنی ژیان و مەرگ دەبنەوە، بە هەمان شێواز بووە. عەشق وەبیرهێنەرەوەی کۆتاییهاتنی ژیان و مەرگە بۆ هەموومان.

دژوارترین چێژ، عەشقە. عەشقێک کە هاوڕێ و دەسلەملانی ئاگاداربوونە لە نزیکبوونەوەی دوا ساتەکانی ژیان یان مەرگ. ئەم دووانە بە شێوازێک جووت دەبن کە پێتوایە یەکیان بەبێ ئەوی تریان مانا و بوونی نییە.

لە فیلمەکەشدا جەخت لەسەر واتای مەرگ بە ڕۆشتنی پیرەپیاوەکە بۆ پرسە وێنا دەکرێت. کاتێک یەکێک لە نزیکانی ئێمەش دەمرێت، بە ئاشکرا دەکەوینە ژێر کاریگەری ئەو ڕاستییەی کە ژیان کۆتایی پێدێت و قەرەبوو ناکرێتەوە. "ئەو"یش لێرەدا داوا لە هاوسەرەکەی دەکات ژیان بەسەر هەردووکیاندا نەسەپێنێت.

ئەو پتەو و بەهێزە، کەسایەتی خۆی ڕادەگرێت و مۆراڵێکی بەرز لە خۆی نیشان دەدات. لە پێگەی مامۆستایەکی مۆسیقادایە کە کۆمەڵێک قووتابی سەرکەتوو پەروەردە دەکات و لە هەلومەرجی نەخۆشی و پیریدا خولیای خوێندنەوەی کتێبێکی نوێیە دەربارەی مۆسیقا. هەوڵدەدات لەوپەڕی لاوازیدا ئەرک و کارەکانی خۆی ڕاپەڕێنێت و چاوەڕوانی دەستی هاوسەرەکەی نەبێت. لەو بارودۆخەدا و بۆ شاردنەوەی لاوازییەکان خۆی لە بینینی تاکەکان دەشارێتەوە، لە ئەلبوومی وێنەکانی دەڕوانێت، چێژ وەردەگرێت و باس لەوە دەکات کە ژیان زۆر جوانە، بەڵام درێژە...

کەچی بارودۆخی "ئەو" ڕۆژ لە دوای ڕۆژ خراپتر دەبێت، لە دواجاردا بە مشتێک گۆشت و ئێسقان دەگۆڕدرێت و وای لێدێت کە بۆ بچووکترین کاری ڕۆژانەی پێویستی بە پێڕاگەیشتن و خزمەتکردن بێت. لە قسەکردن دەکەوێت و وەک منداڵێکی سەرلێشێواو لەنێوان تاکەکاندا ئاوارە دەبێت.

پیاو دەبێتە بینەری شانۆی ئازار، ئازاری بەردەوام و نەبڕاوەی مرۆڤێک،

تەنیا رۆڵی بینەرێک دەنوێنێت و بەکردەوە هیچی پێ ناکرێت، ئەمەش خۆی لە خۆیدا دڵەڕاوکەیەکی ئازاردەرە. دیتنی ئازار بۆ بینەر لە خودی ئەو کەسەی بەرەوڕووی ئازار بووەتەوە، گەلێک دژوارترە. لە قۆناغی دووەمدا کچەکەشیان هەمان رۆڵ دەنوێنێت، کچەکە بینەری دایک و ئەو چرکە ساتانەیە کە ئەو ناتوانێت وشەکان بە تەواوی ئەدا بکات و تەنیا دەگری، کچە لە کۆتاییدا لەنێوان دەرگا کراوە و داخراوەکانی کەش و هەوا بێدەنگەکەیماڵدا بە سەرسوڕمانێکی زۆر و لەوپەڕی ماندووێتیدا دادەنیشێت.

بینینی ئەم بارودۆخە پیاوەکە ناچار دەکات لە جوڵەیەکی کورت و لەوپەڕی هێوربوونداد "ئەو" بکوژێت. لە چرکەساتێکدا و تەواو لەسەرخۆ و لە توندوتیژییەکی سارد و بێدەنگدا. داواکاری ژنەکە بۆ بەرگرتن بە بەردەوامبوون جێبەجێ دەکات، تا ئەو شوێنەی کە پیاوەکە لە هاوسەرەکەی دەپرسێت، کە ئێستا لەبەرچاوی ئەودا چۆنە و ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت: "تۆ دیوەزمەیەکی، کەچی دلۆڤان...".

عەشق لەگەڵ ئازار، لەدایکبوون و رزگارکردن تێکەڵ دەکات. "ئەو" سەرلەنوێ زیندوو دەبێتەوە. پیاوەکە درێژە بە ژیان دەدات. هەموو شتەکان سەرلەنوێ دەست پێدەکەنەوە. بۆ پیاوەکە هێشتا پەیوەندی و عەشق نوێیە. ئەم بابەتە لەو گرتەیەدا کە بیرەوەری و یادگارییەکانی سەردەمی منداڵی بۆ "ئەو" دەگێڕێتەوە، نمایش دەکرێت. "ئەو" بە سەرسوڕمانەوە دەڵێت: "یەکەم جارە ئەم بەسەرهاتە لە تۆ دەبیستم و تا ئێستا بۆت باس نەکردبووم"، پیاوەکەش لە وەڵامدا باس لەوە دەکات کە هێشتا زۆر شتی بۆ باس نەکردووە. پیاوەکە وشەی "هێشتا" بەکار دەهێنێت و دەرفەت بە پەیوەندی و عەشق بۆ بەردەوامبوون و زیندبوون دەدات.

لۆبناز لە کتێبی "زەمەن و ئەویتر" باس لەوە دەکات پەیوەندی لەگەڵ ئەویتر تاقانەبوون نییە، پەیوەندی لەگەڵ ئەویتر نەبوونی ئەویترە، ئەڵبەت نەک نەبوونێکی رووت و رەها. نەک نەبوونێکی رەهاش، بەڵکو نەبوونێک لە ئاسۆی زەمەن و کات. عەشق بێ کۆتایە، نەک یەکگرتوویی. ئێستاش پیاوەپیرەکە عەشق لە نەبوونی کات بۆ نەبوونی تاقانە بێ کۆتایی دەکات.

بە هەموو ئەوانەشەوە "هانکە"ی دەرهێنەری فیلم ئاوڕ لە مانای عەشقیش دەداتەوە، عەشقێک کە لەنێوان ئاسوودەبوون و خۆبەزلزانیندا لە هەڵکشان و داکشاندایە، وەک نموونە کۆمەڵێک پرسیار دەربارەی ئەوەی، کە ئایا هەڵسوکەوتی پیاوە پیرەکە عەشق بوو، یان لە خۆبردوویی؟ خۆنەویستی بوو، یان رزگاربوون لە بارودۆخ؟ هەروەها کابووسەکانی پیاوە پیرەکە و هاتوچۆی لە داڵانەکە و رۆچوون بەناو ئاو و خنکاندنی بە دەستە پیر و چرچەکانی هاوشێوەی

دەستەکانی خۆی، ئەو پرسیارە دەخولقێنێت کە پیاوە پیرەکە خۆکوژیی دەکات، یان ئەویتر دەکوژێت، یان ئازادی یان...؟

ئەوکاتەی ژنەکە بورجەکەی دەخوێنێتەوە: "عەشق، خۆشگوزەرانی چینی دارا، ئەو شتەی کە تۆ پێویستت پێیەتی". بەهەمان شێوەی کە ئەوانیش سەر بە چینی دارای کۆمەڵگان و ئەو عەشقە خاوەنی بەربڵاوترین فەزای واتابییە لەنێوان تاکەکان و کۆمەڵگا و چینە جیاجیا کۆمەڵایەتییەکان.

ژیانی پیاوەکە شێوازێکی رۆتین و وەڕزکەر بە خۆیەوە دەگرێت، بە هەمان شێوە بۆ کچەکەی باس دەکات: "گۆڕینی جل، چێشت دان بە دایکت، فێرکردنی قسەکردن و...". لەم ناوەدا شەقازلەی پیاوەکە لە ژنەکەی کاتێک کە ئاوی ناو دەمی بەردەداتەوە، فەزای رۆتین دەشکێنێت. ئازارێک کە زیاتر لە هەموو گرتە خوێناوی و ترسناکەکان بەردەنگ ئازار دەدات و ئەو بۆ بڕیارێکی جدیتر ئامادە دەکات.

ئامادەبوونی باڵندە لە دوو گرتەی بەر لە مەرگی "ئەو" و پاش مەرگی ئەو بە شێوازێک پەیامهێنەربوونی باڵندە بیردەخاتەوە. لە سەرەتادا پەیامهێنەری ئازادی و ژیانە و لە وێنەی پاش مەرگ پیرەپیاوەکە بە هەستیارییەوە خەریکی یاریکردنە لەگەڵ باڵندەکە. یاری تەنیایی... پیرەپیاوێک کە چەند خولەکێکی پێشووتر ژنەکەی خنکاندووە، کەسایەتی پیاوەکە بەرەوڕووی ناکۆکییەکی ئاشکرا دەکاتەوە بە هەمان شێواز کە مرۆڤ بەرەوڕووی دەبێتەوە، تێکەڵاوییەک لە هەست و کۆمەڵێک پرس و گرێکوێرەی نەناسراو.

لەم فیلمەدا، دەرهێنەر هاوشێوەی بەرهەمەکانی تری جەخت لەسەر راگەیاندن و بەردەوامبوونی تەکنۆلۆجیا لە ژیانی مرۆڤ دەکاتەوە. لە گرتەیەکدا ژنی ناو فیلمەکە لە تەنیایی و بیرکردنەوەی مەرگ لە جێگەی خەوتنەکەی بە باکگراوندی دەنگی تەلەفزیۆنێک نمایش دەکرێت. هەروەها خوێندنەوەی رۆژنامە لەلایەن پیاوەکەوە بۆ ژنەکە، کە هەڵگری کۆمەڵێک هەواڵ و زانیارییە دەربارەی ئەمریکا و ئیسرائیل، ئاماژە بە بەربڵاوبوونی پرسی راگەیاندن لە ژیانی سەرجەمی تاکەکان لە پیر و گەنج و مرۆڤی ئەم سەردەمە دەکات.

**سەرچاوە:**

http://firooze.net/articles/1600